ئاستانە



# ڕیشەسازی
## بۆ پرسەکانی ئافرەت

نووسینی: ئەحمەد سەیید
وەرگێڕان: ڕێکخراوی ئاستانە



# ڕیشەسازی بۆ پرسەکانی ئافرەت

(بەرگی یەکەم)

نووسینی

ئەحمەد سەیید

نووسینی

ڕێکخراوی ئاستانە



# پێشەکی

ئەم پەرتووکەی بەردەستت لە بنەڕەتدا زنجیرە ڤیدیۆیەکی بانگخوازی ناسراو «ئەحمەد سەیید»ە کە ڕێکخراوی ئاستانە هەستاوە بە دووبارە داڕشتنەوەی بە شێوازی پەرتووک لەپێناو گەیاندی سوودێکی زیاتر بە خوێنەرانی بەڕێز.

پێش ئەوەی بچینە سەر بابەتە سەرەکییەکانی ئەم پەرتووکە، چەند پێشەکییەک هەن کە پێویستە وەکوو بەرچاوڕوونییەک بۆ خوێنەرانی بخەمەڕوو تاوەکوو نەخشەیەکی گشتییان لەسەر کۆی بابەتەکانی پەرتووکەکە هەبێت پێش ئەوەی دەست بەخوێندنەوەی بکەن.

پێشەکییەکانیش ئەمانەی لای خوارەوەن:

١. ئەو ناوەڕۆکانەی کە ئەم پەرتووکە لەخۆی گرتووە، کاردانەوە نییە بۆ ئەو دۆخەی کە لە واقعماندا بوونی هەیە، ئەگەرچی پاڵنەر و هۆی قسەکانمان بارودۆخی واقعەکەن. بۆئەوەی مەبەستەکە ڕوونتر بێت: کاردانەوە خۆی لەخۆیدا واتای زیندوویەتی تاکی موسڵمان دەگەیەنێت بەرانبەر ئەو بارودۆخانەی کە لە واقعەکەیدا بوونی هەیە، ئەم جۆرە کاردانەوانەش ئەرێنی و چاکن، بەڵام جۆرێکی دیکە لە کاردانەوە هەیە کە کاریگەری لەسەر تێڕوانینە جێگیر و نەگۆڕەکان هەیە و ڕووخسارێکی دیکە بە ڕووی ڕاستی بابەتەکان دەبەخشێت کە هەڵە و ناپەسەند و نەرێنین و هیچ زانستی نیین، کە بێگومان مەبەستی ئێمە ئەم جۆرەیانە. هەروەها واباشترە کە مرۆڤ کاردانەوەی ڕاستەوخۆی لەگەڵ پرسەکانی واقعەکەیدا نەبێت، بەڵکوو کارلێکی هەبێت لەگەڵیان و کاردانەوەکەی لەسەر بنەمای تێڕوانینێکی دوور

مەودا و ئاسۆیەکی فراوانەوە بونیات نابێت، نەک لەسەر گۆشەیەکی بەرتەسک کە وا لە کاردانەکەوەکەی بکات نەرێنی و ناپەسەند بێت.

٢. بابەتەکانی ئەم پەرتووکە لە کانیاوەکانی سرووشەوە هەڵقوڵاون نەک لە لاسایی کردنەوەی مەرجەعێکی شەرعی و قوتابخانەیەکی دیاریکراو، بەڵکوو لەم پەرتووکە هەوڵدراوە پرسەکان لە کانیاوی قورئان و سوننەت و جێبەجێی کردەیی ڕەسولەوە بەشێوەی تایبەت وەربگیرێت.

٣. ناوەڕۆکی پەرتووکەکە تەنها بۆ وەڵامدانەوەی ڕەوتی فیمینیست و مێگەراکان تەرخان نەکراوە، بەڵکوو کۆی پرسەکانی تایبەت بە ئافرەتی لەخۆگرتووە، ئیدی چ لە لایەنی توندی و داخرانەوە بێت یاخود لەلایەنی شلبوونەوە و کرانەوەیەکی بێ سنوور. ئەگەرچی پرسی فیمینیست خۆی بۆخۆی یەکێکە لە پاڵنەرەکانی نووسینی ئەم پەرتووکە بەڵام کۆی پەرتووکەکە تەنها بۆ وەڵامدانەوەی ڕەوتی فیمینیست تەرخان نەکراوە.

٤. ئیسلام بۆ ژن و پیاویش وەک یەکە و هۆکاری تایبەتکردنی پەرتووکێک دەربارەی ژن هۆکەی ئەو سەرلێشێواوی و گومڕاییە کە لە واقیعدا بوونی هەیە. بۆیە بەواتای ئەوە نایات کە ئیسلام بەشێکی تایبەتی لەسەر ئافرەتان هەبێت؛ بەڵێ لەئیسلامدا حوکمی تایبەت هەیە بۆ ئافرەت، بەڵام بنەمای پێناسەکردنی ژن لە ئیسلامدا ئەوەیە لەگەڵ پیاوان لەڕووی پرسەکانی بیروباوەڕ و حوکمە گەورەکان هاوبەشن، کە ئەمەش بنچینەیە. بۆیە تایبەت کردنی پەرتووکێک دەربارەی ئافرەتان، نابێت بمانخاتە ئەو خەیاڵەوەی کە ئیسلام دابەشبووە بۆ دوو بەش؛ ئیسلام بۆ پیاو و ئیسلام بۆ ئافرەت!

٥. پەرتووکەکە بۆ ئەو ئافرەتە موسڵمانەیە کە باوەڕی بە مەرجەعییەتی سرووش هەیە. بۆیە ئەگەر کەسێک هەبێت شوێن ماددەکە بکەوێت و باوەڕی بە مەرجەعییەتی

سرووش نەبێت: قورئان و سوننەت بە پلەی یەکەم - مەبەستم ئەوەیە بە پلەی یەکەم باوەڕ بەم مەرجەعی بوونە نەکات، ئەوا بە تەواوی سوود لە پەرتووکەکە نابینێت. لەوانەیە لە هەندێک خاڵ سوودی لێ ببینێت، هەروەها ڕەنگە لە هەندێک گۆشە یان تێز سوودی لێ وەربگرێت، بەڵام بۆ کەسێک کە کێشەی لە بنچینەیدا هەیە، دەبێت لە بنچینەکەیەوە دەست پێ بکرێت و ئەم پەرتووکە سوودی تەواوەتی پێ ناگەیەنێت.

ئێ لەوانەیە بوترێت گەر ئافرەتێک کێشەی لەگەڵ مەرجەعی بوونی سرووشدا نەبێت و باوەڕی پێی هەبێت ئیدی ئەم پەرتووکە بۆ؟

ئێمەش دەڵێین زۆربەی ئەوانەی کە باوەڕیان بە مەرجەعی بوونی سرووش هەیە کێشەیان دەبارەی پرسی ئافرەت هەیە بەهۆی زۆری ئەو گومان و پرسە تێکئاڵێنراوانەی کە لەواقعدا بوونی هەیە.

# بەناوی خودای گەورە و میهرەبان

## پێشەکییە زانستییەکان، بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ بابەتی ئافرەت لە ئیسلامدا

ئەم پێشەکییانەی کە لێرەدا باسیان لێوە دەکەین، بۆ تێگەیشتن لە بابەتەکانی دواتر گرنگن، بە واتای ئەوەی ئێمە لە وەڵامی گومانەکان و پێگەی ئافرەت لە ئیسلامدا و هەروەها هەموو بابەتەکانی پەیوەست بە ئافرەت تێناگەین، مەگەر بە تێگەیشتن نەبێت لەم پێشەکییانە، ئەم پێشەکییانەش هەوڵ و کۆشش و هەروەها هەڵسەنگاندنی تایبەتی خۆمن، بۆیە دەکرێت شتی زیاتریش لەخۆ بگرن.

پێشەکییەکانیش بریتین لە دوازدە پێشەکی، کە ئەمانەن:

١ـ سەرەتاییترین ناسنامە و پێناس کە ئافرەت هەڵگری بێت و خۆی پێ بناسێنێت و لەژێر سێبەری ئەو ناسنامەیەدا ژیان بکات، بریتییە لە: بەندایەتی بۆ خودای گەورە، کە پیاو و ئافرەت تێیدا هاوبەشن.

چەند خاڵێک دەربارەی ئەم پێشەکییە:

أ. لە جیهاندا چەندین جۆری کارتی ناساندن هەیە، کە مرۆڤەکان خۆیانی پێ دەناسێنن و پێی دەوترێت ناسنامە، هەندێک ناسنامە هەیە هەموو مرۆڤێک تێیدا هاوبەشە، بۆ نموونە: دانیشتوانی هەر وڵاتێک خاوەنی ناسنامەی نیشتیمانی تایبەت بە وڵاتەکەیانن. هەندێک ناسنامەی تر هەن تایبەتن بە کۆمەڵێکی دیاریکراوەوە، بۆ نموونە: لەناو خەڵکیدا کۆمەڵێک هەیە لایەنگیرییان بۆ ئایینێکی دیاریکراو

هەیە، موسڵمانێک هەڵگری ناسنامەی موسڵمانییەتییە، مەسیحییەک هەڵگری ناسنامەی مەسیحییەتییە، بۆ جوولەکە و بێباوەڕیش هەروەها، کە ئەم ناسنامەیە پێی دەوترێت: ناسنامەی لایەنگیریی ئایینی.

بوون بە خاوەنی هەر ناسنامەیەکیش کۆمەڵێک پێویستی هەیە کە لەسەر هەڵگرەکەی پێویست دەکات -دواتر زیاتر بۆمان ڕوون دەبێتەوە.- کەواتە ناسنامەکان زۆرن، بەتەنیا تایبەت نین بە پیاو، یاخود ئافرەت، بەڵکوو هەردوولا تێیدا هاوبەشن.

لەنێو ئەم هەموو ناسنامانەشدا، باسی سەرەتاییترین ناسنامە دێتە پێشەوە، کە بەهۆیەوە تێڕوانینی خۆت بۆ ژیان و بوونەوەر، لەسەر ئەو ناسنامەیە بونیاد دەنێیت. سەرەتاییترین ناسنامەش کە ئیسلام دەیەوێت لە موسڵماندا بیچەسپێنێت و ببێت بە ناسنامەی ژمارە یەک و هەروەها لەسەر بنەمای ئەو ناسنامەیە، تێڕوانینەکانی بۆ خۆی و ژیان بونیاد بنێت، ئیتر بەبێ ڕەچاوکردنی ئەوەی پیاویت یاخود ئافرەت، منداڵی یاخود گەورە، بازرگانی یاخود فێرخواز، مامۆستایت یاخود هەرشتێکی تر، بریتییە لە «بەندایەتی بۆ خودای گەورە».

ناسنامەی بەندایەتی بۆ خوداش کۆمەڵێک خاڵ لەخۆ دەگرێت، کە خاوەنی ئەم ناسنامەیە و پێویستە هەمیشە لەبەرچاوی بێت: «من بەندەم و دروستکەرێکیش هەیە کە دروستی کردووم، یەقین و دڵنیام بەم ڕاستییە، هەروەها یەقین و دڵنیام بەو شتانەشی کە لەسەر ئەم ناسنامەیە بونیاد نراوە، وەکوو سرووش و پێغەمبەرایەتی و ڕۆژی دوایی ... تاد.»

کەواتە ئاشناکردنی ئافرەت بەم ناسنامەیە -بەندایەتی بۆ خودا- و ئاگادارکردنەوەی لەوەی ژیانی لەژێر چەتری ئەم ناسنامەیە دایە، سەرەتاییترین

کارە کە پێی هەڵبستین. چونکە ئەمڕۆ زۆر ئاراستە و گرووپ هەیە، ناسنامەی ئەوەی کە «ئافرەت» سەرەتاییترین شتە دەیخەنە مێشکی ئافرەتەوە، پێیان وایە هیچ شتێک لەسەرووی ئەم ناسنامەیەوە نییە، بەو واتایەی گرنگ نییە هەڵگری چ ئایینێکیت، بەڵکوو گرنگ دەستەبەرکردنی مافەکانتە وەکوو ئافرەتێک، کە ئەمەش جۆرێکی دیکەی ناسنامەیە و سەنگەری لەو ناسنامەیەی کە ئیسلام لە ئافرەتی دەوێت ـبەندایەتی بۆ خودا. گرتووە.

**ب.** سوودەکانی ئاشناکردن و ئاگادارکردنەوەی ئافرەت بەم ناسنامەیە

- تێگەیشتن لەوەی کە حیکمەتی هەندێک لەو یاسایانەی کە لە شەریعەتدا هاتوون، تەنیا بۆ بەدیهێنانی بەندایەتییە. واتا هەر خوداپەرستییەک کە دەیکەین و هەر یاسا و حوکمێک کە لەسەرمان بڕیار دراوە، مەرج و پێویست نییە کە ئیللا دەبێت بەرژەوەندییەکی دونیایی لە ڕێگەیەوە بەدەست بهێنین، نا نەخێر، هەندێک جار جگە لە بەرژەوەندیی ڕۆژی دوایی، هیچ بەرژەوەندییەکی تریان لەگەڵدا نییە. مەبەستەکانی شەریعەتیش (مقاصد الشريعة) پشتگیری ئەم قسەیەمان دەکەن، ئەوەتا پێشەوا شاتبی؛ پێشەوای زانستی مەبەستەکانی شەریعەت، دەڵێت: «گەورەترین مەبەستێک کە شەریعەتی بۆ نێردراوە بەندایەتییە بۆ خودای گەورە، واتا مرۆڤ پێچەوانەی ئارەزووەکانی بجووڵێتەوە و بە ویستی خۆی ببێت بە بەندەی خودا، هەر وەکوو چۆن لەکاتی تین بۆ هاتندا دەبێتە بەندەی خودا.»

بۆیە ڕەنگە هەندێک لەو حوکمانەی کە تایبەتە بە ئافرەتانەوە. کەسانێک بێن و هەندێک لێکدانەوەی بۆ بکەن کە فڵانە حیکمەتی تێدایە. نەخێر، بەو جۆرە نییە، بەڵکوو هەندێک لە حوکمەکان کە لە ئاییندا بڕیاریان لەسەر

دراوە، ڕەنگە حیکمەتەکەی تەنیا بەدیهێنانی بەندایەتی و خواپەرستی بێت و هیچی تر. کە ئەم باسەش لەلای زانایان شتێکی ڕوونە، هەربۆیە کاتێک قسە لەسەر هۆ و حیکمەتی حوکمەکانی شەریعەت دەکەن، هۆ و حیکمەتی هەندێکیان تەنیا لە بەدیهێنانی بەندایەتی بۆ خودا کورت دەکەنەوە، ئەوەتا کاتێک ئەم حوکمە: ﴿لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ۗ وَإِنْ تُبْدُوا مَا فِي أَنْفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُمْ بِهِ اللَّهُ ۖ فَيَغْفِرُ لِمَنْ يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ مَنْ يَشَاءُ ۗ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾[البقرة: ٢٨٤]، لە ئاسمانەوە دابەزی؛ هاوەڵان لەبەر ئەوەی پێگەی وەحی گەورە بوو لەلایان و دەیانزانی کە هەقە، لە بەرانبەر ئەم ئایەتەدا ترسان و وتیان: «ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئێمە فەرمانمان بە جیهاد و چاکە پێ کرا، جێبەجێمان کرد، بەڵام ئەم حوکمەی کە ئێستا لەسەرمان دراوە، لە توانای ئێمەدا نییە، لەتواناماندا نییە کە هەر ختوورەیەک بە دەروونماندا دێت و کە ڕایشینەگەیەنین، دواتر هەر لێپرسینەوەمان لەسەری لێ بکرێت! ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئێمە ناتوانین.» پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: «بَلْ قُولوا: سَمِعْنا وأَطَعْنا»[1] «بەڵکوو بڵێن گوێمان گرت و گوێڕایەڵین.» ئەوانیش وتیان: «گوێمان گرت و گوێڕایەڵین.» ڕاستەوخۆ بەو ملکەچبوونەیان بۆ حوکمی خودا ئەگەرچی حیکمەتەکەشیان نەدەزانی، حوکمەکەیان لەسەر هەڵگیرا و خودای گەورە ئەم ئایاتەی دابەزاند: ﴿آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ ۚ كُلٌّ آمَنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْ رُسُلِهِ ۚ وَقَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۖ غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ ﴿٢٨٥﴾﴾ [البقرة: ٢٨٥]، واتا: «پێغەمبەری خوا (ﷺ) و باوەڕداران ئیمانیان بەو قورئانە پیرۆزە هێناوە کە لەلایەن پەروەردگارەوە بۆیان دابەزیوە، بە هەموو

---

(١) پێشەوا موسلیم گێڕاویەتییەوە بە ژمارە (١٢٥)

ئەو شتانەشی کە لەم قورئانەدا هەیە. هەموویان باوەڕیان بە خودای گەورە و فریشتەکانی و پەڕتووکە ئاسمانییەکانی و پێغەمبەرانی هێناوە. ئێمە جیاوازی ناکەین لە نێوان هیچ پێغەمبەرێک لە پێغەمبەران و باوەڕ بە هەر هەموویان دەهێنین.هەروەها باوەڕداران و پێغەمبەرەکان فەرموویان: ئەی پەروەردگار ئێمە بە گوێ فەرمایشتی تۆمان بیست و لێی تێگەیشتین و گوێڕایەڵی تۆمان کرد و وەڵامان دایەوە. ئەی پەروەردگار تۆش لێمان خۆش ببە، سەرەنجام و گەڕانەوەی ئێمە هەر بۆ لای تۆیە.»

گوشراوی مەبەست: بۆ هەموو حوکمێک لە ئیسلامدا چ ئەوەی پەیوەستە بە پیاو و چ ئەوەیشی کە پەیوەستە بە ئافرەتەوە نابێت بۆ ئەوە بگەڕێیت کە ئاخۆ چ بەرژەوەندییەکی دونیایی بەهۆی حوکمەکەوە وەدەست دێت. نەخێر، هیچ پێویست ناکات، بەڵکوو دەکرێت هەندێک لە حوکمەکان تەنیا بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندی دوارۆژ دەرکرابن.

- بەدەستهێنانی ڕێز و شکۆ بەرهەمێکی تری بەندایەتییە بۆ خودای گەورە. لەبەرئەوەی ئافرەت زۆر گرفتی وەکوو زوڵم و ستەمی ڕووبەڕوو دەبێتەوە، بەدەستهێنانی ڕێز و شکۆ، ئەم گرفتەیان لەسەر هەڵدەگرێت. ئەمەش لەبەرئەوەیە کە بوون بە بەندەی خودا، بە شێوەیەکی سروشتی و ڕاستەوخۆ دەروون و کەسایەتییەکی شکۆدار دروست دەکات. کەواتە هەرچەند زیاتر ببیت بە بەندەی خودا، ئەوا لەبەرانبەردا ئەوەندە زیاتر مرۆڤەکان لە پێوەر و تەرازووی تۆدا هیچ سامێکیان نامێنێت بەوەی کە سوود و زیانت پێ بگەیەنن. چونکە ئاشکرایە یەکێک لە واتا باوەڕییەکانی بوون بە بەندەی خودا ئەوەیە کە تۆ لات ڕوونە خودا دروستکەر و نەخشەدانەر و گەورەیە و هەروەها بەسەر هەموو شتێکەوە زاڵە: ﴿وَمَا هُمْ بِضَارِّينَ بِهِ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ﴾ [البقرة: ١٠٢]،

واتا: «ئەو جادووگەرانە ناتوانن هیچ زیانێک بە کەس بگەیەنن، مەگەر بە ویستی خوا نەبێت.»، ﴿قَالَ رَجُلَانِ مِنَ الَّذِينَ يَخَافُونَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمَا ادْخُلُوا عَلَيْهِمُ الْبَابَ فَإِذَا دَخَلْتُمُوهُ فَإِنَّكُمْ غَالِبُونَ ۚ وَعَلَى اللَّهِ فَتَوَكَّلُوا إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ ﴿٢٣﴾﴾ [المائدة: ٢٣]، واتا: «(بەڵام) دوو کەس لەوانەی کە ترسی خودایان لە دڵدا بوو و خوا ناز و نیعمەتی ئیمان و دڵنیایی تەواوی پێ بەخشیبوون وتیان: لە دەروازەی شارەوە بچنە سەریان و (یەک هێرشی گەورە بەرن) هەر کە چوونە ئەو دیوەوە، ئەوە بێگومان ئیتر ئێوە سەرکەوتوون (دوژمنتان شکست دەهێنێت، جا بۆ بەدەستهێنانی ئەو سەرکەوتنە) دەبێت: بە تەواویی پشت بە خوا ببەستن ئەگەر ئێوە ئیماندارن.»

بێگومان هەر خوداشە کە ڕێنموونی و گومڕاییکردن و هەروەها سوود و زیانگەیاندن و لابردنی زیانەکەشی بەدەستە: ﴿قُلِ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَنْ تَشَاءُ وَتَنْزِعُ الْمُلْكَ مِمَّنْ تَشَاءُ وَتُعِزُّ مَنْ تَشَاءُ وَتُذِلُّ مَنْ تَشَاءُ ۖ بِيَدِكَ الْخَيْرُ ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٦﴾﴾ [ال عمران: ٢٦]، واتا: «(ئەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، ئەی ئیماندار) بڵێ: خودایە تۆ خاوەنی هەموو شتێکیت، دەسەڵات دەبەخشیت بە هەر کەسێک بتەوێت و دەسەڵات وەردەگریتەوە لە هەر کەسێک بتەوێت، هەر کەس بتەوێت باڵادەستی دەکەیت، هەر کەسێکیش بتەوێت زەلیل و بێدەسەڵات و ژێربەدەستی دەکەیت، هەرچی خێر هەیە هەر بە دەست تۆیە، بێگومان تۆ دەسەڵاتداری بەسەر هەموو شتێکدا.»

هەربۆیە بەندایەتی بۆ خودا کاتێک بە شێوەیەکی گەورە لە دەروونەدا پێک دێت و دروست دەبێت، ڕاستەوخۆ زەبەلاحی دروستکراوەکان بچووک و کەم دەبنەوە.

سا لەبەرئەوە مرۆڤ کە بوو بە بەندەی خودا، دان بە هیچ کەسێکدا نانێت کە شەڕی خودایەتی بکات، ئێوە دەبینن هەندێک لە پیاوان تەنانەت هەندێک لە ئافرەتانیش لەکاتی مامەڵەکردن لەگەڵی، لەماڵەوە یاخود جگە لەو، دەگەن بەو بارودۆخەی کە فیرعەون پێی گەیشت بە وتەکەی: ﴿فَقَالَ أَنَا رَبُّكُمُ الْأَعْلَىٰ ۝٢٤﴾ [النازعات: ٢٤]، واتا: «من پەروەدگاری هەرە بەرز و بڵندی ئێوەم.» بێگومان جادووگەرەکان، چون ببوونە بەندەی خودا: ﴿قَالُوا لَا ضَيْرَ ۖ إِنَّا إِلَىٰ رَبِّنَا مُنْقَلِبُونَ ۝٥٠﴾ [الشعراء: ٥٠]، واتا: «جادووگەرانی ئەوسا و ئیماندارانی ئێستا، بێ ترس وتیان: هیچ زەرەر و زیانی بۆمان نابێت (لە هەڕەشە ناترسین) چونکە ئێمە دڵنیاین کە بۆ لای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە.»

ڕووبەڕووی فیرعەون بوونەوە: ﴿قَالُوا لَنْ نُؤْثِرَكَ عَلَىٰ مَا جَاءَنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ وَالَّذِي فَطَرَنَا ۖ فَاقْضِ مَا أَنْتَ قَاضٍ ۖ إِنَّمَا تَقْضِي هَٰذِهِ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا ۝٧٢﴾ [طه:٧٢]، واتا: «چیت لەدەست دێت، ئەنجامی بدە و دریغی مەکە.» ئەمەش بەرهەمی ئەو بەندایەتییە بوو کە بەدەستیان هێنا. هەربۆیە بوون بە بەندەی خودا، ڕاستەوخۆ ڕێز و شکۆ لە دەروووندا دەچێنێت.

یەکێکی تر لە بەرهەمەکانی ئەم پێشەکییە کە پەیوەندی بە بەرهەمی پێشووەوە هەیە: بوون بە بەندەی خودا، ڕیزپەڕی نەبوون و هەروەها زوڵم و ستەمنەکردنی بەدوادا دێت. کە لە بەرهەمی پێشوودا وتمان، بوون بە بەندەی خودا دەروونێکی شکۆمەند دروست دەکات، شکۆمەندییەک نا کە ببێتە هۆی خۆ بەگەورەزانین و ستەمکردن، بەڵکوو شکۆمەندییەکە کە جگە لە خودا نابێت بە بەندەی هیچ کەس و ڕێگەش بەوە نادەیت هیچ کەس لەبەرانبەرتدا خۆی بباتە ئاستی خودا. بەڵام هەندێک جار لەکاتی مامەڵەکردن، ڕەنگە ستەمێکت لێ بکرێت لەلایەن مێردەکەتەوە، بەڵام لەبەر بەرژەوەندییەکی تری

وەکوو لەبەر خودا و پاراستنی ئارامی ماڵ و منداڵ، لەبری قبووڵنەکردن، ئارامگری هەڵبژێریت و چاوەڕێی پاداشتەکەی لە خودا بکەیت، کە ئەم بارودۆخەش تێکنا گیرێت لەگەڵ واتای شکۆمەندیدا.

کەواتە بەپوختی بەرهەمی ئەم پێشەکییە، بەدەستهێنانی شکۆمەندییە بەبێ تێپەڕاندن و ستەمکردن، واتا بەرگری لە مافەکانی خۆم دەکەم و ڕازی نابم بە زوڵم و ستەم و سووکایەتی. بەڵام، ڕەنگە هەندێکجار و لە هەندێک بارودۆخ، بە هەڵبژاردن و ویستی خۆم ئارام بگرم، وەکوو ئەوەی کە باسمان کرد. ئەوەتا خودای گەورەش باسی ئەم بارودۆخەی بۆ کردووین، کە کاتێک ستەمێکمان لێ کرا، دوو بژاردەمان لەپێشە، یان وەرگرتنەوەی مافی خۆت، یاخود لێخۆشبوون و ئارامگرتن، بەشێوەی ئەرک فەرمانمان پێ ناکات و بۆ دەروونی ئێمەی بەجێ دەهێڵێت: ﴿وَجَزَاءُ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا ۖ فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ ۚ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الظَّالِمِينَ ۝٤٠﴾ [الشورى: ٤٠]، واتا: «جا تۆڵەی هەر تاوانێک بە ئەندازەی تاوانەکەیە بێ زیاد و کەم، ئەو کەسەی لێخۆشبوونی هەبێت و چاوپۆشی و چاکسازی بکات، ئەوە پاداشتی لای خودایە، بەڕاستی خوا ستەمکارانی خۆش ناوێت...»

**٢ـ لە پێویستییەکانی بەندایەتی بۆ خودا: ملکەچبوون و خۆدانەدەستەوەیە بۆ مەرجەعییەتی سرووش، کە «سرووش» لە پێشەکییە گەورەکانە بۆ بونیادنانی تێڕوانینێکی گشتی و ورد دەربارەی مرۆڤ ـپیاو بێت یاخود ئافرەتـ**

ـ هێنانەدی ئەم پێشەکییە، بەستراوەتەوە بە هێنانەدی پێشەکی یەکەمەوە، کە ئەویش ناسنامەی بەندایەتی و بوون بە بەندەی خودای گەورە بوو، ئەم

بەندایەتییەش، هەر لەسەرەتای بەدەستهێنانییەوە کۆمەڵێک شتت لەسەر پێویست دەکات، کە دەبێت ئەنجامیان بدەی، یاخود ملیان بۆ کەچ بکەیت. یەکێکە لەو پێویستیانەش: ملکەچبوون و خۆدانەدەستەوەیە بۆ مەرجەعییەتی سرووش، کە لە پێشەکییە گەورەکانە بۆ بونیادنانی تێڕوانینێکی گشتی و ورد دەربارەی مرۆڤ -پیاو بێت یاخود ئافرەت-.

من لەکوێوە و لەسەر بنەمای چی تێڕوانینە سەرەکییە گەورەکانم لەسەر مرۆڤ بونیاد بنێم؟ مرۆڤ نەک تەنیا ئافرەت، بەڵکوو مرۆڤ -پیاو یاخود ئافرەت- لەکوێوە ئەوە بکات؟

وەڵام: لە مەرجەعییەتی سرووشەوە.

سەرنجێک لەسەر ئەم پێشەکییە:

زۆربەی ڕەوتەکان یاخود زۆربەی ئەو خەڵکانەی کە پشتگیری هەندێک لە ڕەوتە فکرییە لادەرەکانی پەیوەست بە ئافرەت دەکەن. لەکاتی گفتوگۆکردن لەگەڵیان، پێویست ناکات لە وردەکارییەکانەوە دەست پێ بکەیت، بەڵکوو لە بنچینەکانەوە کە مەرجەعییەتە و لە ڕێگەیەوە پێناسەی خۆیان داڕشتووە. چونکە مەرجەعییەتی تۆ و ئەوان جودان، ئەوان بۆ بونیادنانی تێڕوانینی خۆیان دەربارەی مرۆڤ، بۆ سەرچاوەیەک دەگەڕێنەوە و تۆش بۆ سەرچاوەیەکی دیکە. ئەوان بۆ پێناسەکردنی مرۆڤ (چی لەسەر پێویستە و چی لەسەر پێویست نییە یاخود لەپێناو چیدا بژیت و لەپێناو چیدا نەژیت) پشتیان بە تێڕوانینێک و مەرجەعییەتێکی ماددی یاخود فکری «مرۆڤی» بەستووە کە ئەسڵەن پەیوەندی نییە بە دانان بەوەی خودایەک، یاخود پاداشت و پێغەمبەرێک هەیە، بە واتای ئەوەی هیچ پەیوەستییەکی نییە بە تێڕوانینی

ئیسلامەتییەوە، چونکە تێڕوانینی ئیسلامەتی بونیادنراوە لەسەر سرووش و سرووش مەرجەعە.

بۆیە ئەمە خاڵێکی زۆر گرنگە، چونکە هەرچەند گفتوگۆی تێروتەسەل دەربارەی گیروگرفتەکانیان بکەیت و چارەسەریشیان بکەیت، بەڵام ئەگەر تێڕوانینی گشتییان بۆ مرۆڤ پیاو و ئافرەت هێشتا لەسەر بنەمای سرووش بونیاد نەنرابوو، ئەوا توانای چارەسەرکردنی هەموو کێشەکانت نییە.

٣- پێوەری دروستی و نادروستی حوکمەکانی پەیوەست بە ئافرەت، بە هاوتابوونییەتی لەگەڵ ویستی بەدیهێنەر، یاخود ئەو شەریعەتەی کە بەدیهێنەر دەیەوێت

نەک هاوتابوونی ئەم حوکمانە لەگەڵ پێپەسەندبوونی هەموو ئافرەتان (پێپەسەندی هەموو ئافرەتان یەکناگرن)، چونکە ئارەزووەکان یەکناگرن بۆ پێپەسەندبوون لەم جۆرە بابەتانەی پەیوەست بە ئافرەت، بەتایبەتی بابەتە وردەکارییەکان. سا لەبەرئەوە پێوەری دروستی و نادروستی حوکمەکان، هاوتابوونیانە لەگەڵ ویستی دروستکار یاخود ئەوەی دروستکار دەیەوێت.

پێپەسەندبوون و پەسەندنەبوون، بابەتێکی بەربڵاوە، زۆر جار دەبیستیت کەسێک دەڵێت: فڵانە شتم پێ پەسەند نییە. ئەزیزم جگە لەتۆ کەسانیتر هەن کە هەمان شت بە پەسەند دەبینن، ئایا هەق دابەش بکەین و ئەو بەشەت پێ بدەین کە پێت پەسەندە؟! بەڕاستی ئەمە کێشەیە!

بێگومان دوای ئەوە ڕەنگە بڵێت: تێڕوانینی من وایە کە هەقی ڕەها بوونی نییە و بەڵکوو هەق شتێکی ڕێژەییە. بۆیە پەسەندی و ناپەسەندی لەم بابەتەدا نییە و بابەتەکە ڕێژەییە. کە ئەمەش کێشەیەکی ترە.

سا لێرەوەیە کە گرنگی بوون بەبەندەی خودامان بۆ دەردەکەوێت، مرۆڤ کە خۆی بە بەندەی خودا زانی، پەی بەوە دەبات کە لەو ئاستەدا نییە بە ڕەخنەیەک کە سەرچاوەی گرتووە لە دەروونێکی لووت بەرزەوە، مامەڵە لەگەل تەشریعی خوداییدا بکات. بەڵکوو ئەرکی مرۆڤ ئەوەیە کە بپرسێت و دەکرێت هەندێک شتی وردی لا ڕوون نەبێت و پرسیاریان هەبێت، هاوشێوەی ئافرەتان و پیاوانی هاوەڵی پێغەمبەر (ﷺ). دیسان ئەوە دووپات دەکەمەوە، کە هەموو ئەوانەی باسی دەکەین، پەیوەستیان بەیەکەوە هەیە و لەسەر یەکتر بوونیاد نراون.

بیرمە لە سەرەتای گفتوگۆکانم دەربارەی وەڵامدانەوەی گومانەکان. گفتوگۆم لەگەڵ ئافرەتێک کرد دەربارەی ڕەوایی داوێنپیسی (الانحراف الجنسي یاخود (paraphilia): کە وەها وێنا دەکرێت نەخۆشییەک بێت، بارودۆخێکی خۆنەویستانە بێت) ئەو چونکە بەهۆی ئارەزووەوە، کارەکەی پێ پەسەند بوو، دەیوت: «چۆن دەبێت ئایینێک بێت و ئەم کارە حەرام بکات؟ شتی وەها چۆن دەبێت؟»

باشە ئەزیزم ئێ خۆ شەست ملیۆن ئافرەتی دیکە هەن کە ئەمە بە شتێکی ناپەسەند و پێچەوانەی سروشتی ئافرەتی دادەنێن، ئایا ئێستا هەق بەپێی ئەم ئارەزووانە دابەش بکەین؟!

مرۆڤ دەبێت هەندێک پاشەکشە بکات لەو شتانەی کە خۆی پێی پەسەندە و پەی بەوە ببات و دڵنیایی هەبێت کە پێوەرێکی دیکەی ڕاست و ڕەوان لە سەروویەوە بوونی هەیە، کە بڕیاری لەسەر دروستی و نادروستی ئەم بابەتانە داناوە.

٤ـ پێشەکی چوارەم (پەیوەستە بە سێیەمەوە): ڕوانینی ئیسلام بۆ بابەتەکانی

**ئافرەت، بەتەنیا لە ڕەچاوکردنی لایەنی ئافرەتانەوە سەرچاوەی نەگرتووە**

خودای کاربەجێ کە حوکمەکانی پەیوەست بە ئافرەتی جێگیر کردووە و بڕیاری لەسەر داوە، بەو شێوەیە نەبووە کە تەنیا ڕەچاوی ئەوە بکات ئاخۆ ئافرەت چۆن ئەم پەیامە وەردەگرێت، یاخود بەو واتایەی کە ئافرەت لە هەسارەیەکی دیکەدا بەتەنیا بژیت و کەسی لەگەڵدا نەبێت. بەڵکوو ئیسلام کە حوکمێکی جێگیر کردووە و بڕیاری لەسەر داوە، چەند لایەنێکی هەمەجۆری ئافرەتی ڕەچاو کردووە؛ لایەنێک لە ڕووی بەندایەتیی خوداوە، لایەنێک لە ڕووی مافەکانەوە کە هەیەتی، لایەنێک لە ڕووی ئەو ئەرکانەی کە لەسەریەتی.

هەریەک لەم لایەنانەش، بار و ڕۆڵی جیاوازی تێدا هەیە. هەندێک جار کەسانێک هەن کە گەردوون لەسەر بنەمای تێڕوانینی کەسییەتی هەڵدەسەنگێنن، ئەمەش تۆزێک جیاوازە لە پێپەسەندبوون کە پێشتر باسمان لێوە کرد. لێرەدا قسەکە لەسەر ئەم قسەیە: «ئیسلام کە هات و بڕیاری ئەم حوکمەی دا بۆچی ڕەچاوی منی نەکردووە؟!»

ئەزیزم! ئیسلام بەتەنیا تایبەت بە ئافرەت یاخود پیاو نەکراوە، یاخود بەوجۆرە نەهاتووە، کەوا بڕوانێت تۆ بەتەنیا لەم هەسارەیەدا دەژیت. نا نەخێر، بەڵکوو ئەو یاسا و بڕیارانەی کە ئیسلام جێگیری کردوون، گشت لایەنێکی تێدا ڕەچاو کراوە. بەتەنیا تۆی ڕەچاو نەکردووە، یاخود تۆی تایبەت نەکردووە کە بەو جۆرە مامەڵەت لەگەڵدا بکات کە حیزبێک یاخود گرووپێکی فیمینیزمن و دەتانەوێت کۆمەڵگەیەکی ئافرەتانە دروست بکەن. نەخێر، ئیسلام بەو جۆرە حوکمی جێگیر کردووە کە تۆش یەکێکی لەو پێکهاتانە کە کۆمەڵگە پێک دێنن و جگە لە تۆش پێکهاتەی تر هەن و پەیوەندیی سروشتی ئەم

پێکهاتانەش پەیوەندییەکی تەواوکارییە، کە ڕۆڵ و بواری جیاوازی تێدایە.

ئیسلام تۆی لە جێگەیەکدا دانەناوە کە تەنیا ماف وەربگریت، بەڵکوو ئەو ڕۆڵانەی کە ئیسلامی ئافرەتی پێ ناساندووە، هەندێکجار مافی بۆ هەیە و هەندێکجاریش ئەرکی لەسەر شانە.

**٥ـ لە ئیسلامدا حوکمەکانی پەیوەست بە ئافرەت، پاشکۆن نەوەک سەربەخۆ، پاشکۆن بۆ پایە و بنچینە گەورەکان (نەک بۆ پیاو)**

واتا بە شێوەیەکی سەرەکی ئەو حوکمانەی کە پەیوەستن بە ئافرەت و بڕیاریان لەسەر دراوە، پاشکۆن. بەو واتایەی لەسەر چەند ڕاستی و بنچینەیەک بونیادنراون و سەربەخۆ نین. بۆیە فەلسەفەی ئیسلام لە تەشریعی حوکمدا بەوجۆرە نییە کە پیاو و ئافرەت کۆمەڵێک ئەرک و مافی هاوبەشیان هەیە و ئەرکەکانی پەیوەست بە ئافرەت زیاترن بە چەند ئەوەندە. نا نەخێر، بەڵکوو هەریەکێک لەو ئەرک و مافانە، لەسەر کۆمەڵێک بنچینە وەرگیراوە و بونیاد نراوە کە ئەمەش خاڵێکی زۆر گرنگە.

ئەوەتا دەبینین حیجاب لە ئیسلامدا دوای ١٧ بۆ ١٨ ساڵ لەدوای دەستپێکردنی پێغەمبەرایەتییەوە واجب کرا. خۆ حیجاب ئاشکرایە ئەرکە، بەڵام ئەم ئەرکە لەدوای ئەوەندە ساڵ و بونیادنانی لەسەر کۆمەڵێک بنچینەی هاوبەشی نێوان ئافرەت و پیاو کە پێی هەڵدەستان، وەکوو: بوون بە بەندەی خودا و ئارامگری و دامەزراوەیی لەسەر ئیسلام و ئایین فەرز کرا. لە سەرەتای ئیسلامدا پیاوان و ئافرەتانی موسڵمان هەردوولا هاوبەشبوون لە ڕووی ئەشکەنجەدان و ڕێگری لێکردنەوە، کە هەردوولا ئارامگرییان هەڵدەبژارد تاوەکوو مردن. ئەوەتا سومەیە (دایکی عەممماری کوڕی یاسر و یەکەم شەهیدی نێو ئیسلام) دوای ئەو

هەموو ئازار و ئەشکەنجەدانە، ئارامگری هەڵبژارد تاوەکوو مردن، بۆیە دەبینین پیاو و ئافرەت بنەما و بنچینەی هاوبەشیان هەبووە، تەنانەت ئەو ئەرکانەشی کە هاوبەشن و سەرەکین وەکوو فەرزەکان، هەندێکیان دواکەوتن و دواتر دابەزین. کەواتە بابەتەکە بەو جۆرە نەبووە کە ڕاستەوخۆ و بە شێوەیەکی سەریەخۆ ئافرەت کۆمەڵە شتێکی لەسەر فەرز کرابێت، بەڵکوو ئەوەی لەسەریان کراوە بە ئەرک، پاشکۆی ئەم بنەما و بنچینانەبوون کە باسمان کردن. هەروەها زۆربەی حوکمەکانیش کە لەسەر ئافرەت کراوە بە ئەرک، پەیوەستە بەو سرووشتی جێبەجێکردنەوە کە پێی هەڵدەستێت لە بەندایەتیەکاندا.

٦ـ حوکمە شەرعییەکانی پەیوەست بە ئافرەت بەشێکە لە تەشریعێکی ڕێکخراوی هەمەلایەن، ڕوانینی بۆ مرۆڤەکان لە دووردوەیە، لە چوارچێوەی ئامانجێکی دیاریکراو و بەرنامەیەکی شوێنکەوتراو.

کرۆکی پێشەکییەکە ئەمەیە: حوکمە شەرعییەکانی پەیوەست بە ئافرەت بەشێکە لە تەشریعێکی ڕێکخراوی هەمەلایەن، بۆیە ڕوانین و تێگەیشتنت لە حوکمەکانی پەیوەست بە ئافرەت، بەستراوەتەوە بە پەیبردن بەوەی تەشریعاتی ئیسلامی ڕێکخراو و هەمەلایەنە و حوکمەکانی پەیوەست بە ئافرەتیش بەشێکن لێی. ئەمەش بەتەنیا تایبەت نییە بە حوکمەکانی ئافرەتەوە، بەڵکوو ئەمە خودی فەلسەفەی ئیسلامە لە تەشریعاتەکانیدا (کە بە پەیبردن بە تەواوی تەشریعاتەکە، لە حوکمە لاوەکییەکان تێدەگەیت.) بۆ نموونە: کاتێک ئیسلام دەڵێت «زینا لەسەر پیاوان و ئافرەتان حەرامە.» ئاشکرایە کە زینا یەکێکە لە تاوانە گەورەکان، بەڵام زینا هەنگاوی دەیەمە کە مرۆڤ دەیبڕێت و حەرامە گەورە و سەرەکییەکەیە، بەڵام پێش زینا چەندین هەنگاوی تر هەن.

هەربۆیە ڕێگریکردن و حەرامکردنی ئیسلام بۆ هەنگاوەکانی پێش زینا، بە ئامانجی تووشنەبوون و نەکەوتنە نێو زیناوەیە، چونکە لە ئیسلامدا ئەو شتانەی کە دەقی حەرامکردنیان لەسەر هاتووە دەکرێن بە دوو جۆرەوە: هەندێکیان حەرامکراون لەبەر حەرامی خودی خۆیان، هەندێکی تر حەرامکراون لەبەر ئەوەی هۆکار و ئامرازن بۆ گەیشتن بە حەرام. ئەمەش تایبەت نییە بە بابەتی ئافرەتەوە، بەڵکوو هەمەلایەنە و فەلسەفەی ئیسلامە لە تەشریعاتەکانیدا.

سا ئینجا ڕابمێنن کە کەسێک لەخۆوە بەناو بابەتەکە دەکەوێت، خودی حەرامەکە واز لێ دێنێت و باسی ناکات، بەڵام دەیکات بە هاتوهاوار لەسەر هەنگاوی دووەم کە ئامرازە بۆ گەیشتن بە حەرامە گەورەکە و دەڵێت: «بڕوانن ئیسلام چۆن هەنگاوی دووەم لەخۆڕا حەرام دەکات.»

ئەزیزم! چونکە تۆ لەوە نەگەیشتووی کە بابەتەکە تەنیا یەکێکە لە بەشەکانی تەشریعێکی ڕێکخراو، پەی بەوە نابەیت کە حەرامکردنی هەنگاوی ژمارە دووەم لەبەر ڕێگریکردنە لە گەیشتن بە هەنگاوی ژمارە دەیەم. یاخود مرۆڤێکی ماددی کە تەشریع و سیستەمێکی هەمەلایەن و ڕێکخراوی نییە کە لەڕێیەوە لە بوونەوەر و ژیان و ... هتد. بڕوانێت و لێک هەڵوەشاوەتەوە، دێت بەم تێڕوانینە لێکهەڵوەشاوەی خۆی لە ئیسلام دەڕوانێت و دەڵێت: «ئایەتی ژمارە پازدە دەربارەی فڵانە بابەت کێشەی تێدایە و گونجاو نییە.» ئیسلام تەشریعێکی ڕێکخراوی هەمەلایەنە، کە ڕەنگە هەندێک شت حەرام بکات بۆ ڕێگریکردن و نەگەیشتن بە حەرامی گەورەتر.

ئەوەتا لە ئیسلامدا هەندێک جار سوجدەبردن بۆ خوداش حەرامە و ڕێگری لێ کراوە. سوجدەبردن کە گەورەترین خواپەرستییە، لە هەندێک کاتی دیاری کراودا حەرامی دەکات و ڕێگری لێ دەکات. وەکوو ئەو کاتانەی کە ڕێگری

کراوە تێدا نوێژ ئەنجام بدرێت (وەکوو: ساتی خۆرهەڵهاتن و خۆرئاوابوون)، کە بەکردنی تاوانبار دەبیت، هۆی حەرامکردن و ڕێگریکردنەکەش بە ئامانجی نەکەوتنە نێو حەرامی گەورەترەوەیە، نەک لەبەر خودی کارەکە خۆی. چونکە خودی کارەکە خۆی، گەورەترین خواپەرستییە. بەڵام گەر لە یەکێک لەو کاتانەدا ئەنجامت دا، ئەوا دەبێتە ئامرازێک بۆ لاسایی کردنەوەی هاوبەش دانەران کە سوجدە بۆ خۆر و مانگ دەبەن لەکاتی هەڵهاتن و ئاوابوونیدا، لەبەر ئەوە ئیسلام ڕێگری دەکات لەو کاتانەدا نوێژ ئەنجام بدرێت.

هەربۆیە بیرۆکەکە لێرەدایە کە ئیسلام دامەزراوە لەسەر تەشریعاتێکی ڕێکخراوی هەمەلایەن مامەڵە لەگەڵ حوکمە شەرعییەکاندا دەکات. ڕەنگە ڕێگریکردنی لەهەندێک شت، بۆ نەگەیشتن و نەکەوتنە نێو شتگەلێکی ترەوە بێت.

سا بەهۆی ئەم تێگەشتنەوەوەیە کە لە ئیسلامدا پەی بە زۆر حوکمی پەیوەست بە ئافرەت دەبەین، بەو واتایەی کە حوکمەکانی بەشێکن لە تەشریعاتێکی ڕێکخراوی هەمەلایەن. ئەمەش لە ئاسانکارییەکانی ئیسلامە نەک قورسکردن کە یارمەتیت دەدات لە بەدیهێنانی ویست و مەبەستەکانی، بۆیە ئەگەر ڕێگری شتێکی لێ کردی ڕێگریکردنێکی مەبەستدار، ئەوا یارمەتیت دەدات؛ بەجۆرێک ڕێگری پێشەکییەکانیت لێ دەکات کە ئەگەر پابەندنەبیت بە نەکردنیان، ئەوا دەگەیت بە حەرامە گەورەکە.

**٧ـ ئەو سەرچاوەیەی کە پێوەرە بۆ زانینی پێگەی ئافرەت لە ئیسلامدا؛ دەقەکانی سرووش و جێبەجێکردنەکانی پێغەمبەرە (ﷺ)**

خۆ سەرچاوەی تر هەن، بەڵام لاوەکین و بە شێوەی ڕێژەیی پێگەی ئافرەت

دیاری دەکەن، بۆیە نابن بە پێوەری سەرەکی. هەربۆیە تاکە سەرچاوە کە پێوەرە و لە ڕێگەیەوە پێگەی ئافرەت لە ئیسلامدا دەزانین: دەقەکانی سرووش و جێبەجێکردنەکانی پێغەمبەرە (ﷺ)، کە بەسەر ڕای شەرعزان و زانا و موفتییەکاندا باڵا دەستە.

گێڕانەوەی ناکۆکییەکان بۆ لای دەقەکانی سرووش کە لەم ئایەتەدا هاتووە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنْكُمْ ۖ فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴿٥٩﴾﴾ [النساء: ٥٩]، واتا: «ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! گوێڕایەڵی خودا و پێغەمبەر(ﷺ) و فەرمانڕەواکان بکەن کە لە خودی خۆتانن (لە بیروباوەڕ و پابەندیدا)، خۆ ئەگەر لە شتێکدا بوو بە کێشەتان دەربارەی حوکمی خودایی، ئەوە ئەو کێشەیە بگێڕنەوە بۆ لای خودا و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) (کە قورئان و سوننەت دەگەیەنێت)، ئەگەر ئێوە باوەڕتان بە خودا و بە ڕۆژی دوایی هەیە، (ڕەفتارکردنتان) بەو شێوەیە چاکترین و جوانترین سەرچاوەیە بۆ چارەسەری کێشەکانتان.» بەتەنیا کۆمەڵە ناکۆکییەکی دیار ناگرێتەوە، بەڵکوو تەنانەت ناکۆکی زانایان کە خودی خۆشیان قسە لەسەر گێڕانەوەی ناکۆکییەکان دەکەن بۆ لای دەقەکانی سرووش، دەگرێتەوە.

هەربۆیە گێڕانەوەی وتەکان و موحاکەمە کردنیان بۆ لای دەقەکانی سرووش و جێبەجێکردنەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، بەتەنیا وتە پووچەکانی ئەهلی باتڵ ناگرێتەوە، بەڵکوو ئیجتیهادی هەندێک لە زانایانیش لە چوارچێوەی شەرعدا، بەهەمان شێوە دەگێڕدرێتەوە بۆ لای پێوەری سەرەکی کە دەقەکانی سرووش و جێبەجێکردنەکانی پێغەمبەرە (ﷺ).

سا لەبەرئەوە هەر بابەتێکی تازە کە دێتە پێشەوە و زانایان ئیجتیهاد دەکەن تێیدا و وتەکانیان دەگێڕدرێتەوە بۆ لای پێوەری سەرەکی. باسکردنی ئەم بابەتەش بەوشێوەیە نییە کە هەموو کەس بەم کارە هەڵبستێت، نا نەخێر، بەڵکوو ئەهلی خۆی هەیە و باسکردنەکەی ئێمەش تەنیا وەکوو بنەمایەک و ڕاستییەک بوو.

خاڵێکی گرنگ کە دەبێت ئاماژەی پێ بدەین: پێویستی پێداچوونەوە بە ژیاننامەی پێغەمبەر (ﷺ) و چۆنییەتی جێبەجێکردنی حوکمەکان کە قورئان فەرمانی پێ کردووە. ئەو شتانەی کە پێغەمبەر (ﷺ) جێبەجێی کردوون، ڕوونن. هەروەها بە شێوەیەکی سروشتیش وتەکانی پێغەمبەر (ﷺ) زۆربەی ئەوەی کە لە قورئاندا هاتووە ڕوون دەکاتەوە، بەڵام لە ڕێگەی جێبەجێکردنەکانییەوە، وێنەکەت لەلا ڕوون دەبێت کە ئاخۆ فڵانە شت ئەم ئایەتە دەیگرێتەوە، یاخود نا.

هەربۆیە یەکێک لەو شتانەی کە یارمەتیدەرن بۆ زانینی پێگەی ئافرەت لە ئیسلامدا، بەتەنیا دەقەکانی سرووش نییە، بەڵکوو جێبەجێکردنەکانی پێغەمبەریشە (ﷺ). بۆ نموونە: بۆئەوەی لەم ئایەتە تێبگەین: ﴿وَاللَّاتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلَا تَبْغُوا عَلَيْهِنَّ سَبِيلًا ۗ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا﴾ [النساء: ٣٤]، واتا: «ئەو ئافرەتانەش کە ئێوە دەترسن سەرپێچیتان بکەن ئەوە ئامۆژگارییان بکەن و جێگەیان لێ جیا بکەنەوە(لەگەڵیان مەخەون) و لێیان بدەن(لێدانێک کە لەشی عەیب دار نەکات) جا ئەگەر گوێڕایەڵیان کردن ئەوە ئیتر هیچ ڕێگەیەک لە دژیان مەگرنە بەر بەڕاستی خوا هەمیشە بەرز و بڵندی گەورەیە.»

پێمان گەیشتووە کە دایکە عائیشە فەرموویەتی: «پێغەمبەری خودا (ﷺ) هەرگیز بە دەستەکانی لە ئافرەت و خزمەتکاریشی نەداوە.» بەهۆی کۆکردنەوەی دەق و جێبەجێکردنی پێغەمبەرەوە (ﷺ)، لەبابەتەکە تێدەگەیت. بەڵام، هەندێک کەس چۆن تێدەگەن؟ ویستی ئەم گەڕانەیان نییە، بەڵکوو هەر بەوەندە گوێبیستی ئایەتەکە بوو، لە خێزانی دەدات، هەروەها بە شێوەیەکی ساویلکەیی و ڕووکەشیانە لە بابەتەکە تێدەگات.

کەوایە بۆ ئەوەی لە بابەتەکە تێبگەین: دەڕوانین ئایا مەگەر پێغەمبەر (ﷺ) لە خێزانەکانی تووڕە نەدەبوو؟ ئایا مەگەر ناکۆکی لەگەڵیاندا نەبوو؟ ئایا بۆ هەندێک لە خێزانەکانی ئایەتی سەرزەنشتکردن بە شێوەیەکی توند، دانەبەزی؟ کەچی سەرەڕای ئەوانەش، ئەوەتا عائیشە خاتوون پێمان دەفەرموێت: «ما ضرب رسولُ اللَّه صلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ خادمًا لَه ولا امرأةً ولا ضرب بيده شيئًا» [سەحیح سونەن ئیبنو ماجە: ١٩٨٤] واتا: پێغەمبەر (ﷺ) هەرگیز بەدەستەکانی لێدانی خێزان و خزمەتکارەکانی نەکردووە. بەم جۆرەیە کە لە بابەتەکە تێدەگەیت، تێدەگەیت لەوەی ئەم بابەتە دەکەوێتە چ خانەیەکەوە؟ بوار و مەوداکەی کامەیە؟ بێگومان دوای کۆکردنەوەی لەگەڵ هەندێک شتی تردا.

لەبەرئەمەیە کە پێویستمان بە ڕوانین و تێڕامانە لە جێبەجێکردنەکانی پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی بەتایبەت ئەوانەی پێغەمبەر (ﷺ)، چونکە بە شێوەیەکی ورد سنووری زۆربەی بابەتەکانی تایبەت بە ئافرەت دەردەخات.

٨ـ جیاکردنەوەی ئەم بابەتانە لە یەکتر و دانانی هەر کامێکیان لە ئاستی خۆیدا: ئەوانەی دەقیان لەسەر هاتووە لەگەڵ ئەوانەی کە ئیجتیهادی

زانایەکن، ئەوانەی کە کۆمەڵی زانایانی لەسەرە لەگەڵ ئەوانەی ڕاجیایی لەسەرە، ئەوانەی ڕاجیاییەکان ڕەچاوکراون لەگەڵ ئەوانەی ڕاجیاییی نامۆن.

ئەم پێشەکییە بەتەنیا تایبەت نییە بەو بابەتانەی کە پەیوەستن بە ئافرەتەوە، بەڵکوو بۆ بابەتەکانی جگە لە ئافرەتیشە. کە ڕادەمێنین، دەبینین زۆربەی کێشەکانی ئەمڕۆ لێک جیانەکردنەوەی ئەم ئاستانەیە لە یەکتر و دانانی هەرکامێکیانە لە شوێنی ئەوی دیکە.

ئەی برای خۆم تۆ کە وتەیەکی دیاریکراوت لە بابەتێک کە ڕاجیایی هەڵدەگرێت لەو بابەتانەی کە پەیوەستن بە ئافرەتەوە پێ پەسەندە، لەبەر ئەو بەڵگانەی کە لەبەردەستدان پێت وایە باشترە، ئەوە بزانەش کە وتەیەکی تر هەیە ڕەنگە پێشەوایانی ئیسلام لە چوار مەزهەبەکە یاخود زۆرینەی زانایان دانیان پێدا نابێت. بۆیە کاتێک مامەڵە لەگەڵ ڕایەکی تر دەکەیت -ئەگەرچی ڕەتکراوەش بێت- دەبێت کەمتر گرژبوون و توندیت هەبێت بە بەراورد بەو بابەتانەی تر کە کۆکیان لەسەرە. هەروەها مامەڵەکردنت لەگەڵ ڕاجیاییەکی نامۆ، دەبێت جیاواز بێت لەگەڵ ڕاجیاییەکی ڕەچاو کراو. ئەمەش بەتەنیا بۆ بابەتەکانی پەیوەست بە ئافرەت نییە، بەڵکوو بۆ زۆر لایەنی تریش.

هەروەها دەبینین کە زۆر کەس بەهۆی بێئاگاییان لە شەریعەت، بەڕاست و چەپدا قسە دەکەن و بڕیار دەردەکەن و لێکدانەوە بۆ هەموو شتێک دەکەن و بە ئیجتیهادیشی دادەنێن. خۆ ئەگەر پێی بڵێیت: «ئەوەی تۆ دەیڵێیت وتەیەک و ڕاجیاییەکی نامۆیە.» پێت دەڵێت: «ئێوە هەرکەستان خۆشنەوێت پێیان دەڵێن ئەوەی هێناوتانە وتە و ڕاجیاییەکی نامۆیە!» ئەزیزم بابەتەکە بەوشێوەیە نییە، تەنانەت ئیبن عەبباسیش دەکرێت شتێکی وتبێت و نامۆ بێت.

لەکاتێکدا ئیبن عەبباس پێغەمبەری خودا (ﷺ) بۆی پاڕاوەتەوە: «اللهم علمه الکتاب» [بوخاری: (٧٥)] واتا: «خودایە فێری قورئانی بکە!» کەچی لە کەلەپووری فیقهی ئیسلامیدا، هەندێک وتەی ئیبن عەبباس هەیە کە لای زانایان بەگشتی نامۆیە. سا لەبەرئەوە دەکرێت هەندێک وتە و بڕیار هەبن، نامۆ بن، با هەندێک لە گەورەکانیش وتبێتیان. ئەمەش دەمانگەیەنێت بە خاڵی سەرەکی، ئەویش ئەوەیە مامەڵەمان لەگەڵ ڕای نامۆ لە ئاستی خۆیدا بێت و زیادەڕەوی تێدا نەکەین و لە ئاستی خۆی نەیبەینە دەرەوە، وەکوو ئەوەی وەها مامەڵە لەگەڵ ڕای نامۆ بکەین وەک ئەوەی دەقی سرووش بێت، نا نەخێر، هەر بابەتێک و لە ئاستی خۆی، کە ئەم جیاکارییەمان کرد، ئینجا دەتوانین ڕای نامۆ لە ناوەندی بڕیاردان دوور بخەینەوە. چونکە ڕەنگە هەندێک ڕای نامۆ لە زانایانی سەردەمەوە دەربارەی ئەوەی پەیوەستە بە ئافرەتەوە پێت بگات، بۆیە نابێت وەکوو دەق و بڕیاری سرووش سەیری بکەیت و نەتوانیت ڕەتی بکەیتەوە. چونکە ئەمڕۆ فەتوای نامۆ دەربارەی ئافرەت لەلایەن هەندێک زاناوە بەربڵاوە. چ بەلای سووککردن و شلکردنەوە بێت! یاخود لە ڕووی توندکردن و ڕێگری لێکردنەوە! بۆیە پێویستە شەڕ لەگەڵ ڕا نامۆکاندا بکرێت لە هەردوو باری شلکردن و توندکردندا و هەروەها بەتەنیا لایەکیان نەگرین بۆئەوەی نەکەوینە کێشەوە، چونکە هەیە کە نیازی بۆ شلکردن هەیە، هەمیشە ڕای بەرانبەرەکەی بە نامۆ دەبینێت، کە ئەمەش ڕاست نییە، بەڵکوو مەبەست لە ڕای نامۆ، ئەو واتا شەرعییە دیاریکراوەیە کە زانایان دیارییان کردووە، نەک بەپێی کەس و لایەن.

**٩ـ جیاکردنەوەی ئەو بابەتانەی کە بنچینەیان هەیە لە شەریعەتدا (تەنانەت ئەگەرچی نەگەیشتبنە ئاستی دڵنیایی، یاخود ئیجتیهادیش بن.) لەگەڵ دابونەریتی کۆمەڵایەتی و مامەڵەی تاکێک.**

تێگەیشتنمان لە بابەتی ئافرەت و ئەو تێکگیران و گومانانەی کە پەیوەستن بە ئافرەتەوە، بەستراوەتەوە بەم پێشەکییەوە.

ئێمە پێویستمان بە بەڵگە نییە بۆئەوەی بڵێین زۆربەی تێکگیرانەکان کە لەواقعی ئەمڕۆدا بوونی هەیە، بەهۆی بڕیاردانە بەسەر ئیسلام لەبەر نەریتێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراو کە لەناو موسڵماناندا بەربڵاوە، یاخود ڕەفتاری کەسێک، یان کۆمەڵێکی دیاریکراو، یاخود فەتوای زانایەک کە ئەسڵەن ناچێتە چوارچێوەی ئیجتیهادیشەوە، تاوەکوو بڵێین فەتواکەی بنچینەیەکی هەیە لەشەرعدا، کە ئەمە شتێکی ڕوونە.

ئەو بابەتانەی کە ئیجتیهادین، موفتی و بڕیاردەر یاخود لێکۆڵەری شەرع، دەبێت مامەڵەکردنی لەگەڵیان جیاواز بێت بەراورد بە بابەتێکی یەکلاکراوە، هەروەها دەبێت جیاوازی نێوان ئەو بابەتانەی کە دامەزراون لەسەر بنچینەیەکی یەکلاکراوە و ڕوونن لەگەڵ ئەوانەی کۆمەڵی زانایانی لەسەرە، یاخود ئەوانەی دامەزراون لەسەر بەڵگەیەک و پەسەندکراون لەگەڵ ئەوانەی کۆمەڵی زانایانی لەسەر نییە، هەروەها ئەوانەی کە ئیجتیهادی کەسین لە چوارچێوەی شەرعدا. بەڵام دەکرێت ڕاستی و هەڵە لەخۆ بگرن، بۆ خەڵکی ڕوون بکاتەوە.

بۆ نموونە بەم شێوازە ڕوونی بکاتەوە: «من پێم وایە فلانە بابەت کە تازەیە و پەیوەستە بە ئافرەتەوە، شەرع ڕێگری لێ دەکات. وای دەبینین ڕێگریکردن لێی نزیکترە لە دەقی شەرعی و ڕۆحی شەریعەتەوە، چونکە کە شەریعەت بە دەقی ڕوون یەکلایی کردووەتەوە کە فلانە بابەت حەرامە، ئەوە من بەهۆی ئەوەوە وەها لەم بابەتە تازەیە دەڕوانم کە ئامرازە بۆ کەوتنە نێو ئەو حەرامە ...» بەم شێوەیە کە بابەتەکەم ئیجتیهادییە، ئەوا هیچ کێشەیەکی تێدا نییە

تا کاتێک بەم چەشنە ڕوونی بکەمەوە، یاخود پەیامەکەم بە شێوەی توند و یەکلاکراوە نەگەیەنم کە من مەرجەکانی ئیجتیهادم تێدابوو و هەروەها ئەهلی بووم و گەشتم بە ئەنجامێک، با نەم پێکابێت و هەڵەش بم، بەڵام خۆ بەلای کەمەوە پەیامەکەم وەکوو ئیجتیهادێک گەیاندووە و زیادەڕەویم تێیدا نەکردووە و نەمبردووەتە ئاستی بابەتێکی یەکلاکراوە لە شەرعدا و هەروەها بواری ئەوەم تێیدا هێشتووەتەوە کە بابەتەکە هەڵگری گفتوگۆ و ڕاجیاییە، با هەڵەش بم بەڵام خۆ ڕوونم کردەوە، یاخود بەشێوەیەک ڕوونم کردەوە کە بابەتەکە قابیلی گفتوگۆ و ڕاجیاییە.

کەواتە ڕۆڵی بانگخواز و بڕیاردەر و لێکۆڵەری شەرع ئەوەیە کاتێک بابەتێک پێشکەش دەکەن، پێویستە ئاستی پەیامیان جیاواز بێت بەگوێرەی ئاستی حوکم و ئیجتیهادەکە لە شەرعدا. کاتێک بابەتگەلێکی تازە دێنە پێشەوە، هیچ نەبێت پەیامەکەیان توند نەبێت یاخود بەشێوەی یەکلاکەرەوە مامەڵەی لەگەڵدا نەکەن. لەبەرئەوەی هەندێک لەوانەی بەناوی شەریعەتەوە پەیام دەردەکەن، کێشەیان بۆ دروست دەبێت لە واقعدا چونکە فەتوای حەرامی بابەتێک دەدەن و بە شێوەی یەکلاکەرەوە بڕیار لە بابەتێک دەدەن، دواتر کە گۆڕانکاری لە کۆمەڵگەدا ڕوو دەدات، ناچار دەبێت کە لە فەتواکەی پەشیمان ببێتەوە. ئەمە جگە لەو کێشەیەی کە لەناو خەڵکدا دروست دەبێت.

١٠ـ فەلسەفەی ئیسلام لە دەرکردنی حوکمەکانی پەیوەست بە ئافرەت و جگە لە ئافرەتانیش، دادگەرییە نەوەک یەکسانی.

سا ئەوانەی کە دێن دەقەکانی شەریعەت، بە کۆمەڵێک بنەمای یەکسانی دادگایی دەکەن، ئەوا تووشی کێشەی زۆر دەبنەوە. کێشەکانیش لە دەقەکاندا

نییە، بەڵکوو لەبەر دادگاییکردنی دەقەکانە لەسەر بنەمای یەکسانی.

هەڵەی زۆربەی ئەوانەی بەناوی شەریعەتەوە قسە دەکەن، لێرەوەیە کە لەژێر کاریگەری ئەو دادگاییکردنەی دەقەکانی شەریعەت بە کۆمەڵێک بنەمای یەکسانی، ئەمانیش لێکدانەوە بۆ دەقەکان دەکەن و دەیانەوێت لەگەڵ بنەماکاندا بیانگونجێنن، سەرەڕای ئەم بابەتەش، تەنانەت زیادەڕۆیی دەکەن لە یەکسانکردنی موسڵمان و بێباوەڕ! دەڵێن ئیسلام ئایینی یەکسانییە و بەو جۆرە مامەڵە لەگەڵ هەموو مرۆڤێکدا دەکات کە یەکسانن. ئەزیزم تۆ دەبێت ڕوونی بکەیتەوە لە چ ڕوویەکەوە؟ ئەگەر مەبەستت ئەوەیە بەشێوەی ڕەها لە هەموو ڕوویەکەوە، ئەمە فریودانە. تۆ، یان فێڵ لە خەڵکی دەکەیت و بە ویستی خۆت درۆیان لەگەڵ دەکەیت، یاخود نەزانی بە تێڕوانینی شەرع، ئەوەتا خودای گەورە لەم ئایەتەدا: ﴿أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ اجْتَرَحُوا السَّيِّئَاتِ أَنْ نَجْعَلَهُمْ كَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَوَاءً مَحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ ۚ سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٢١﴾﴾ [الجاثية: ٢١]، واتا: «ئایا ئەوانەی کە گوناه و تاوانەکانیان ئەنجام داوە، وایان زانیوە هەر وەک ئەوانە حیسابیان بۆ دەکەین کە ئیمانیان هێناوە و کاروکردەوە و چاکەکانیان ئەنجام داوە؟! ژیانی دونیا و مردن و دوای مردنیان وەک یەک دەبێت؟! ئای کە بڕیاری خراپ بڕیار دەدەن.»

لێرەدا دەفەرمووێت یەکسان نین. تەنانەت لە ئەحکامیشدا، هەندێک ئەحکام هەیە تایبەتن بە بێباوەڕ و هەندێکی دیکە تایبەتن بە موسڵمان. بابەتەکە ڕوونە کە حوکمی ئیسلامی دەربارەی موسڵمانان جیایە لەگەڵ بێباوەڕان. بۆ نموونە: وەکوو ئەحکامەکانی ئەهلی زیممە و ... تاد.

کەواتە فەلسەفەی ئیسلام لە تەشریعدا نەک هەر بۆ بابەتی پیاو و ئافرەت،

بەڵکوو لە هەموو لایەنێکدا، دادگەرییە نەوەک یەکسانی. بەمەش دەگەین بەوەی، مەرج نییە کە ئافرەت لە هەموو حوکمێکدا لەگەڵ پیاودا یەکسان بێت.

- سوودی ئەم بنچینەیە چییە بۆ ئەوانەی کە سرووش لەلایان مەرجەعە؟

لەسەری نابێت کە بەم شێوەیە بەرگری بکات: «ئیسلام لە هەموو شتێکدا بۆ یەکسانی پیاو و ئافرەت هاتووە. چ بابەتی میرات بێت، یاخود شتی دیکە.» نا نەخێر، ئیسلام لە بنچینەدا بڕیاری بە یەکسانی پیاو و ئافرەت بە شێوەیەکی گشتی و ورد لە هەموو شتێکدا نەداوە. خۆ ئەگەر لەبابەتێکدا بڕیاری بە یەکسانی هەردوولا دابوو، ئەوە دادگەری وای خواستووە کە یەکسان بن. چونکە دادگەری دەکرێت یەکسانی تێدا بێت، هەروەها دەکرێت فەزڵ دانەسەر یەکتریشی تێدا بێت. کە ئەمەش بەتەنیا تایبەت نییە بە ئیسلام، ئەوەتا لای هەمووان ڕوونە. لە شوێنەکانی وەکوو قوتابخانە و فەرمانگەدا، مامەڵەکردن لەگەڵ قوتابی یاخود فەرمانبەرەکاندا لەسەر بنچینەی یەکسانی نییە، چونکە هەیە باش و زیرەک و چالاکە، هەشە بەپێچەوانەوە، مەگەر وا نییە؟

هەربۆیە ڕاستە دادگەری یەکسانیش لەخۆ دەگرێت، بەڵام هەمیشە خۆی لە یەکسانیدا نابینێتەوە. بەڵکوو دادگەری چەترێکی گەورەترە لە یەکسانی، دەکرێت هەندێک جار یەکسانی لەخۆ بگرێت و دەکرێت بەو شێوەیەش نەبێت.

١١- تێڕامان لەو بڕیارانەی کە ئیسلام دەربارەی ئافرەت داوییەتی لە هەموو بارودۆخ و قۆناغەکانی ژیانیدا -بەتایبەت لە قۆناغی پیریدا-.

ئەمە یەکێکە لەو کێشە زانستیانەی کە ئافرەت لە دەرەوەی پەیڕەوی ئیسلامی تێی دەکەوێت، کە جوولانەوە و فەلسەفە و پێشنیارێک دەخەملێنێت لەسەر بنەمای ئەوەی کە چی لەم تەمەنەدا پێشکەش بە ئافرەت کردووە.

بە جۆرێک هەندێک جار بەتەواوی بێئاگا دەبێت لە پێویستییەکانی ئافرەت لە قۆناغەکانی تری تەمەنیدا، بەتایبەت «قۆناغی پیری»، دەزانن کە هیچ دەقێک لە شەریعەت نەهاتووە کە پێگە بە ئافرەت ببەخشێت وەکوو ئەوەی کە لە تەمەنی پیریدا پێی بەخشیوە، کە ئەمەش هاوشێوەی نییە لە هیچ شوێنێکی دیکەدا، بە شێوەیەک کە لەپێناویدا هەڕەشە و دواندنی توند بەکار هێنراوە، هەربۆیە خودا دەفەرموێت: ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِنْدَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلَاهُمَا﴾ [الإسراء: ٢٣]، واتا: «پەروەردگاری تۆ بڕیاریداوە کە جگە لەو کەسی تر نەپەرستن، هەروەها بڕیاریداوە چاکەکاریش بن لەگەڵ دایک و باوکتاندا، هەر کاتێک یەکێکیان یان هەردووکیان بە پیری کەوتنە لای تۆ ...» ئەمەش دەرخستنی قۆناغێک لە قۆناغەکانی مرۆڤە ـدایک و باوکایەتیـ دەبێت جێگەی گرنگیپێدانی زیاتر بن.

هەندێک جار ئافرەت کە گەنجە سەیری سروشتی هیچ ماف و پێگەیەک ناکات مەگەر ئەوانە نەبێت کە تایبەتن بە قۆناغی گەنجی، ئەوەی بیر دەچێت کە فەلسەفەکانی دیکە چ شتانێکی خراپ و مافێکی کەم پێشەکەش بە ئافرەت دەکەن کاتێک دەگات بە قۆناغی پیری.

هەروەها لەو قۆناغانەی دیکە کە ئیسلام ڕێزی ئافرەت و مێی گرتووە، کاتی لەدایکبوون و منداڵییەتی، بە جۆرێک بایەخێکی زۆرتری لە نێر پێ داوە، کە ئەگەر بە بنەمای یەکسانی لێی بڕوانین، دەڵێین: «باشە شەریعەت بۆچی یەکسانی نەکردووە و هێندە بایەخی بە ئافرەت داوە؟!»

بۆ نموونە: عوقبەی کوڕی عامر لە پێغەمبەری خودای بیستووە کە فەرموویەتی «من كان له ثلاث بنات فصبر عليهن، وأطعمهن وسقاهن،

وکساهن من جدته، کن له حجابا من النار یوم القیامة.» [سەحیح سونەن ئیبنو ماجه: ٣٦٦٩]، واتا: «هەر کەسێک سێ کچی هەبوو، ئارامی لەسەریان گرت و خواردن و خواردنەوەی پێدان و پۆشتەی کردن بەو سامانەی کە هەیەتی، ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا دەبن بە پارێزەرێک بۆی لە ئاگر.» ئەمەش یەکێکە لەو قۆناغانەی کە پێگەی ئافرەت دەردەخات لە ئیسلامدا.

ئەمرۆ هەندێک ئاڕاستە هەن پێشوازی دەکات و جەختی لێ دەکاتەوە و بگرە شەڕ لەگەڵ ئەوانەدا دەکات کە بە بابەتی «لەباربردن» ڕازی نابن، کە لەباربردن ڕۆحی نێر و مێی تێدا تیادەچێت، ئیسلام مامەڵە لەگەڵ ئەم بوونەوەرە دەکات ئەگەرچی بچووک بێت و لە زگی دایکیشیدا بێت بە هەمان ئەو پیرۆزییە کە لە تەمەنی پیریدا هەیەتی، خۆ ئەو هیچ شتێکی نەکردووە و هیچ دەنگێکی لەم فەزایە نەبیستووە، بەڵام سەرەڕای ئەوەی کاتێک دەمرێت نوێژی لەسەر دەکرێت، کە ئەم نوێژکردنەش دەرخستنی پێگەیەتی، خەڵکی لە دواوەی کۆرپەیەکەوە ڕیز دادەبەستن، هەروەها مافیشی هەیە و ... تاد.

١٢- بەراوردکردنێکی گشتی بارودۆخی ئافرەت بە سەردەمی نەفامی سەرەتا و ئەو ئاڕاستە لادەرانەی کە هەن

تەنیا ئەو وتەیەی ئیمامی عومەر کە لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە بەسە کە بەراوردی بارودۆخی ئافرەتمان لە ئیسلام و پێش ئیسلام بۆ پوخت دەکاتەوە و دەڵێت: «والله إنا کنا في الجاهلية ما نعد للنساء أمراً، حتى أنزل الله فيهن ما أنزل، وقسم لهن ما قسم» [بوخاری: ٤٩١٣] واتا: «سوێند بێت ئێمە لە سەردەمی نەفامیدا ئافرەتمان بە هیچ دانەدەنا، تاوەکوو خودای گەورە لەسەریان ئەوەی دابەزیوە، دایبەزاند و ئەوەی بەشیان بوو بۆی بەش کردن.»

# چەند پێشەکییەک دەربارەی پێگەی ئافرەت لە ئیسلامدا

ئەو پێشەکییانەی کە پێشتر باسمان کرد، بۆ ڕامان بوو لە بابەتی ئافرەت، نەوەک پێگەکەی.

## - پێشەکییەکان دەرباری پێگەی ئافرەت لە ئیسلامدا:

١- لەکاتی گەڕان بۆ پێگەی ئافرەت لە ئیسلامدا، یەکێک لە هەڵە بەربڵاوەکان ئەوەیە لەو پێگانەدا بگەڕێین کە تایبەتن بە ئافرەتەوە بەبێ پیاو.

کاتێک دەتەوێت بە زۆربەی خەڵکی بڵێیت من دەمەوێت دەربارەی پێگەی ئافرەت قسەتان بۆ بکەم لە ئیسلامدا، بەتەنیا ئەو دەق و حوکمانە بەبیریاندا دێت، کە تێیدا ئافرەت بەتایبەت ڕێزی لێنراوە، ئەمەش هەڵەیەکی زانستییە. هەربۆیە نابێت بۆ ئاشنابوون بە پێگەی ئافرەت، بەتەنیا لەو دەقانە بڕوانیت کە تایبەتە بە فەزڵدانی تایبەتی ئافرەت.

بەڵکوو ڕێگەی ڕاست ئەوەیە کە بڕوانین لەو ڕێزەی کە ئیسلام بەشێوەی گشتی لە مرۆڤی موسڵمانی گرتووە، ئەو ڕۆڵ و ئەرکانەی کە پێی بەخشیوە، ئەو ڕاستیانەی کە دەیەوێت پەیڕەوی بکات، ئەو ژیانەی کە دەیەوێت لەپێناویدا بژیت، ئەو ئامانجانەی کە دەیەوێت بەدی بهێنێت. هەربۆیە دروست نییە کە بەدوای پێگەی ئافرەتدا بگەڕێم لە ئیسلامدا، بەڵام ئەم ڕاستییە گەورانەی

ئیسلام لەبیر بکەم و بەتەنیا پێگەی ئافرەت لەو دەقانەدا ببینمەوە کە تایبەتن بە ئافرەت. وەکوو ئەو دەقانەی کە پێگەیان بەدایک یاخود کچ بەخشییوە ـچاکەکردن لەگەڵیاندا..

سا لەبەرئەوە گرنگە کە سەرەتا بۆ پێگەی ئافرەت دەگەڕێین لە ئیسلامدا، لەوەوە دەست پێ بکەین کە ئاخۆ بە شێوەیەکی گشتی پێگەی موسڵمان چییە لە ئیسلامدا. چونکە ئافرەت پێش ئەوەی ئافرەت بێت، موسڵمانە ـوەکوو ناسنامەـ ئیتر هەرشتێک کە بە جوانییەکانی ئیسلام دادەنرێت و هەروەها ئەو جوانییانەی کە ئیسلام لە موسڵمانی دەوێت، ئەوە بە هەمان شێوە بە پێگەی ئافرەت دادەنرێت لە ئیسلامدا.

جگە لەوانەش، زۆر لایەنی تر هەن کە تایبەتە بە پێگەی ئافرەت لە ئیسلامدا، بەڵام هەڵە گەورەکە لەوەدایە کە وا بزانیت، هیچ شتێک لەسەر پێگەی ئافرەت نەهاتووە، یاخود ئافرەت هیچ پێگەیەکی نییە جگە لەو دەقە تایبەتانەی کە دەربارەی هاتوون و تایبەتن پێیەوە.

٢ـ یەکێک لە هەڵە گەورەکان لەکاتی گەڕان بۆ پێگەی ئافرەت لە ئیسلامدا، کورتکردنەوەی پێگەکەیەتی لە مافە دونیاییەکاندا

چونکە یەکێک لەلایەنە گەورەکانی گەڕان بۆ پێگەی ئافرەت، ڕوانینە بۆ ئەو هەلانەی کە لە جێگە مەزنەکاندا بۆی فەراهەم کراوە، بۆئەوەی تێیدا شتانێکی پێ ببەخشرێت کە دونیای ماددی تێدەپەڕێنێت.

٣ـ ئیسلام؛ ئافرەت ناخاتە خەیاڵی ماف، یاخود مافی خەیاڵییەوە، بەڵکوو بەڕاستی ئەوەی پێدەبەخشێت کە سوودی پێ دەگەیەنێت، کە بونیاد نراوە لەسەر گەورەیی و ئامانجە مەزنەکانی ئیسلام.

ئەم پێشەکییە لەوپەڕی گرنگی و ترسناکی دایە. چونکە کێشەی ئەمڕۆ ئەوەیە زۆربەی ئەوانەی داوای مافی ئافرەت دەکەن، داواکردنەکەیان لەژێر چەتری خەیاڵی مافەکان یاخود بەتەنیا لەژێر چەتری مافە دونیاییەکان دایە.

خۆ ئەگەر من باوەڕدار بم بەخودا و فریشتە و نێردراو و ڕۆژی دوایی و هەروەها باوەڕدار بم بە بەهەشت و دۆزەخ و بۆ هەرکامێکیان بەڵگەشم هەبێت و لەگەڵیشیدا باوەڕدار بم بەوەی ئەم دونیایە دونیای تاقیکردنەوەیە، چۆن ڕێگە بە خۆم دەدەم کاتێک ئافرەتێک ڕێگایەکی گرتووەتە بەر بەرەو ئاگری دەبات ئەم ئاگرەش بێکۆتایە. کە بڵێم: «وەڵڵا بۆئەوەی ڕەچاوی هەست و سۆزی ئافرەت بکەین دەبێت فلانە و فلانە مافی بدەینێ کە دەکرێت بیگەیەنێت بە ئاگریش بۆئەوەی بڵێین مافی ئافرەتمان داوە!»

نا نەخێر، ئیسلام پارچەپارچەکردن و لێکردنەوەی تێدا نییە، ئیسلام پێت دەڵێت: «پێش هەموو شتێک، سەرەتا بوونی تۆ لێرەدا کاتییە، ڕۆژی دوایی و پاداشت و دادگاییکردنت لەپێشە، ... تاد.» دواتر ئەو مافانەی کە ڕاستین، وەکوو موسڵمانێک پێت دەبەخشێت بەبێ ڕەچاوکردنی ئەوەی پیاوی، یاخود ئافرەت. گەورەترین مافیش کە پێت دەبەخشێت: بەرچاوڕوونییە بە ڕێگەی چاکە و کامەرانی و ڕزگاربوون لە ڕۆژی دوایی، داواکردنی هەر مافێکیش کە سەرەنجامەکەی تیاچوونە لە ڕۆژی دواییدا، ئەوە مافێکی خەیاڵاوییە.

هەربۆیە ڕابمێنن زۆربەی ئافرەتان و هەروەها پیاوانیش، لە خەیاڵی کۆمەڵێک ماف دان و داوای دەکەن، کە هیچ شتێکی تێدا ڕەچاونەکراوە، بۆ نموونە:

- خۆشی بێسنوور و شەڕکردنی سەخت لەپێناو شەرعاندنی بابەتی لەباربردن، گوایە کە هەقە.

ـ ئازادی ئافرەت لەهەر ڕەفتارێکی جەستەیی بەبێ هیچ ڕێکخستنێک و گەوجاندنی بەوەی دەستەبەرکردنی ئەم مافە بۆی باشتر و چاکترە.

٤ـ ئیسلام گۆڕەپانێکی بە ئافرەت بەخشییوە، کە دەتوانێت تێیدا کێبڕکێی چاکەی تێدا بکات و هەوڵی خۆی بەکاربهێنێت و بەرەو گۆڕەپانەکەش ئاڕاستەی کردووە. هەروەها ئەگەر لەم گۆڕەپانەدا پلەی بەرزی بەدەست هێنا، ڕێزلێنانی پێ دەبەخشێت، کە ئەویش گۆڕەپانی: کێبڕکێکردنە بۆ ڕۆژی دوایی، کارکردن بۆ ئیسلام، بەدیهێنانی ئەو ئامانجەی کە بۆی دروستکراون.

ئەم گۆڕەپانەش بۆ هەموو مرۆڤێک کراوەیە، کە ئەگەر تێیدا ئەنجامی باشی بەدەستهێنا، ئیسلام پێشی دەخات و خەڵاتی پێ دەبەخشێت و چاکەی دەدات بەسەر ئەوانی تردا. هەربۆیە لات سەیر نەبێت کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا لِلَّذِينَ آمَنُوا امْرَأَتَ فِرْعَوْنَ إِذْ قَالَتْ رَبِّ ابْنِ لِي عِنْدَكَ بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ وَنَجِّنِي مِنْ فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِ وَنَجِّنِي مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ ﴿١١﴾﴾ [التحريم: ١١]، واتا: «هەروەها خوا نموونەی هێناوەتەوە بە هاوسەرەکەی فیرعەون بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە، کاتێک وتی: پەروەردگارا لەلای خۆت لە بەهەشتدا ماڵێکم بۆ دروست بکە (تا بەردەوام بە دیدارت شاد ببم) و لە دەست فیرعەون و کاروکردەوەی ڕزگارم بکە و لەدەست ئەم قەومە ستەمکارەش دەربازم بکە.»

ئایا لێرەدا ئافرەت لەبەرئەوەی ئافرەتە، پێشخراوە؟ نەخێر، بەڵکوو لەبەرئەوەی لە گۆڕەپانەکەدا پێشکەوتووە، بۆیە پێشخراوە. هەروەها پیاوانیش بەهەمان چەشن هەن کە خەڵاتکراون لەبەرئەوەی لە گۆڕەپانەکەدا پێشکەوتوون. لای کەسیش شاراوە نییە، یەکەمین کەسێک کە موسڵمان بوو بێت، دایکمان خەدیجە بووە.

بەم شێوەیە گۆڕەپانەکە بۆ هەموو کەس کراوەیە. ئەمە ڕێگایەکی مەزن و

گەورەیە، هەرکەس چاک بوو تێیدا و پێشکەوت پیاو، یاخود ئافرەت ئەوا بۆی دەنووسرێت و پێش دەخرێت.

هەروەها ئەم پێشەکییە هۆکارە بۆئەوەی وەکوو مرۆڤێکی موسڵمان کارە لە پێشینەکانت ڕێک بخەیتەوە، گۆڕەپانی کێبڕکێ و دواتریش پێوەری چاکتربوون، کە ئەمەش کۆمەڵە بابەتێکی دیاریکراوی خەیاڵی نییە. هەروەها کێبڕکێ لێرەدا کێبڕکێی ململانێ نییە، بەڵکوو کێبڕکێیەکی ستایشکراوە، کێبڕکێ دەکرێت لەپێناو چاکە، ئەم هاوکێشەیە لەو هاوکێشەیەی کە حاڵی ئەمڕۆی پێ دەکێشرێت بەتەواوەتی جودایە.

لەدوای ئەم چوار پێشەکییەی کە باسمان کرد، ئێستا لەو لایەنانە دەڕوانین کە بەتایبەت باسی پێگەی ئافرەت دەکەن.

هەروەکوو پێشتریش وتم هەڵەیەکی گەورەیە ئەم خاڵە بەتەنیا وەربگیرێت. نەخێر، دوای ئەوەی بە شێوەیەکی گشتی لە پێگەی ئافرەتمان ڕوانی لە ئیسلامدا، ئینجا ئاوڕ بۆ ئەو لایەنانەش دەدەینەوە کە بەتایبەت پێگەی ئافرەتی تێدا باسکراوە لە ئیسلامدا.

هەربۆیە دووبارە دەیڵێمەوە هەڵەیەکی گەورەیە شەڕی گفتوگۆ و مشتومڕ لەسەر بابەتی ئافرەت لە ئیسلامدا بەتەنیا لە لایەنە تایبەتەکەدا کورت بکەیتەوە، نەخێر هەرگیز، بەلای ئەوانەی بەتەواوی لە بابەتی ئافرەت تێگەشتوون لە ئیسلامدا و بەبابەتێکی جیای دانانێن، وەکوو ئەوەی ئیسلامێکی تر تایبەت بە ئافرەت هەبێت. بەلایانەوە ئەوەی کێشەی لەگەڵ ئافرەت هەبێت لە ئیسلامدا، ئەوا لەڕاستیدا کێشەی لەگەڵ ئیسلامدا هەیە.

## ئەو لایەنانەی کە بەتایبەت پێگەی ئافرەت دەردەخەن لە ئیسلامدا

١ـ شه‌ڕی ئیسلام له‌گه‌ڵ ئه‌و نه‌ریته نه‌فامییانه‌ی كه پێگه‌ی ئافره‌تیان كه‌م كردبووه‌وه، یاخود سته‌میان لێ ده‌كرد.

ده‌مه‌وێت لێره‌دا ئاماژه به‌وه بكه‌م هه‌ندێك له خه‌ڵكی هه‌یه، ده‌ڵێن: «ئێوه ئه‌سڵه‌ن به‌هه‌ڵه‌دا چوون كه ده‌ڵێن ئافره‌ت له سه‌رده‌می نه‌فامیدا سته‌ملێكراو بووه، به پێچه‌وانه‌وه، ئافره‌ت له‌و سه‌رده‌مه‌دا ڕێزلێگیراو و شكۆدار بووه و هه‌روه‌ها به‌شداری هه‌ندێك له جه‌نگه‌كانی كردووه ... تاد.» هه‌ندێك نموونه‌ی تریشت بۆ ده‌هێنێته‌وه، ئه‌م وتانه به‌ڵگه‌ن له‌سه‌ر كێشه‌ی كه‌می زانیاری و هه‌روه‌ها لاوازی تێڕوانینه. له لایه‌نێك ڕاده‌مێنێت و واز له لایه‌نه‌كانی تر ده‌هێنێت. خۆ ئه‌گه‌ر ده‌م بكه‌یته‌وه و بڵێیت: «ئافره‌ت له ئیسلام» ڕاسته‌وخۆ ده‌ڵێت: «براكه‌م! بڕوانه ئیسلام چه‌ند سووكایه‌تی به ئافره‌ت كردووه له فڵان و فڵانه شتدا.» باشه، ئێ ئه‌زیزم زیاتر بڵێ، له چی تردا؟ ته‌واو هه‌رئه‌وه‌نده‌ی پێیه، چونكه ئه‌و كه له سه‌رده‌می نه‌فامی ده‌ڕوانێت لایه‌نه باشه‌كه‌ی ده‌هێنێت و بۆتی باس ده‌كات، به‌ڵام كاتێك له ئیسلام ده‌ڕوانێت لایه‌نه خراپه‌كان كه ئه‌و پێی وایه خراپه‌ ده‌هێنێت، واز له هه‌موو باشییه‌كانی تر ده‌هێنێت كه فراوانتر و زیاترن.

هه‌ربۆیه ئێمه ناڵێین ئافره‌ت له سه‌رده‌می نه‌فامیدا هیچ پێگه‌یه‌كی نه‌بووه، هه‌روه‌ها ناشڵێین هیچ ئافره‌تێك نه‌بووه كه له سه‌رده‌می نه‌فامیدا پێگه‌ی هه‌بوو‌بێت، به‌ڵكوو ده‌ڵێین ئافره‌ت له نه‌فامیدا به شێوه‌یه‌كی گشتی كۆمه‌ڵێك ڕێسا و یاسایان له‌سه‌ر جێبه‌جێ ده‌كرد، كه سته‌م بوو ده‌رهه‌قیان.

ئه‌گه‌رچی هه‌ندێك لایه‌ن هه‌بوون له سه‌رده‌می نه‌فامیدا، كه‌وا لێیان نه‌ده‌ڕوانرا كه شتێكی پووچن، هه‌ندێك شتی قبوولكراویان هه‌بوو، به‌ڵام له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا

یاسای تریان هەبوو، ستەمکارانە بوو. ئیسلام هات و ئەو یاسا ستەمکارانەی ڕاست کردەوە کە لەسەر ئافرەت جێبەجێ دەکرا. ئەمەش یەکێکە لەو لایەنانەی کە پێگەی ئافرەتی تێدا بەتایبەت لە ئیسلامدا دەردەکەوێت. بۆ نموونە:

ـ زیندەبەچاڵکردنی کچ: کە لە نەفامیدا بەربڵاو بوو، ئیسلام هات و ئەم کارەی بە تاوانێکی گەورە لەقەڵەم دا.

ـ ئافرەت بە میرات دەگیرا، بەلای کەمەوە لە هەندێک ناوچەی عەرەبدا، هەربۆیە ئایەت هاتە خوارەوە دەربارەی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَرِثُوا النِّسَاءَ كَرْهًا﴾ [النساء:١٩] «ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، بۆتان نییە ئافرەتان بەزۆر بکەنە میراتی خۆتان...»

ـ تەعزێ باریی لەدوای مردنی پیاوەکەیەوە. کە هەندێک مامەڵە هەبوو زیادەڕۆیی تێدا دەکرا. لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە، کە زەینەب دەڵێت: «كانت المرأة إذا توفي عنها زوجها، دخلت حفشا ...» [بوخاری:٥٣٣٧] واتا: «ئافرەت ئەگەر پیاوەکەی مردبا دەچووە نێو حەفشا ...» حەفش ماڵێکی بچووکە و بنمیچەکەی نزمە، خراپترین جلی دەکردەبەر و بۆن و هیچ شتێکی لە خۆی نەدەدا تاوەکوو ساڵێک تێدەپەڕی! ساڵێکی تەواو! دواتر هەندێک نەریتی خراپتر هەبوو، لەدوای ساڵەکە ئەنجامی دەدا.

هەربۆیە کاتێک لە ئیسلامدا تەعزێباری کرا بە چوار مانگ و دە ڕۆژ، ئافرەتێک هات ـ وەکوو ئەوەی هەندێک شتی پێ قورس بێت ـ لە پێغەمبەری (ﷺ) دەپرسی، پێغەمبەریش (ﷺ) پێی فەرموو: «قد كانَت إحداكنَّ تَرمي بالبَعرةِ على رأسِ الحولِ، وإنَّما هيَ أربعةُ أشْهرٍ وعشرًا. فقُلتُ: ما رأسُ الحولِ؟ قالت: كانتِ المرأةُ في الجاهليَّةِ، إذا هلَكَ زوجُها، عمَدت إلى شرِّ بيتٍ لَها،

فجلَسَت فيه، حتَّى إذا مرَّت بها سنةٌ، خرجَت فرمَت وراءَها ببَعرَةٍ» [سەحیح سونەن نەسائی: ٣٥٤٠] واتا: «ئافرەتێک لە ئێوە ئەگەر مێردی بمردایە لە سەردەمی نەفامیدا، دەچوویە نێو خراپترین ماڵەوە و تێیدا دادەنیشت تاوەکوو ساڵێکی بەسەردا تێدەپەڕی، دواتریش دەردەچوو و پشقڵێکی لەدوای خۆی فڕێدەدا وەکوو ئەوەی هیچی نەکردبێت بۆ مێردەکەی هێشتا. بەڵام ئەوەتا ئیسلام کردی بە چوار مانگ و دە ڕۆژ، ژیانێکی ئاساییش دەژین لەو ماوەیەدا بەپێچەوانەی سەردەمی نەفامی.» وەکوو ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) پێی بفەرمووێت یاد بکەنەوە کە پێش ئیسلام چۆن بوون؟ ئیسلام هات هاوسەنگی ڕاگرت لەنێوان پێگەی پیاو و هەروەها ئەم یاسایە لەگەڵ ئەوەی نەفامیدا.

ـ هەروەها دایکە عائیشە کە لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە باسی جۆرەکانی هاوسەرداری و خوازبێنی کردووە کە لە نەفامیدا بەربڵاو بوون، کاتێک باسی شێوازە خراپەکەی دەکرد، دەیوت: «بۆ نموونە پیاوێک ئافرەتی خۆی دەنارد بۆ پیاوێکی خاوەن پلە و خاوەن ڕەچەڵەک، تاوەکوو ئەوکاتەی کە منداڵێکی لێ ببێت، خاوەن ڕێز و پێگە بێت. منداڵی خانەدان و خاوەن ڕەچەڵەکی دەویست و بە ویستی خۆی ئافرەتەکەی دەنارد بۆ لای پیاوی خانەدان.» [بوخاری: ٥١٢٧] ئەمەش یەکێکی ترە لەو شێوازانەی کە ئیسلام بنەبڕی کرد.

٢ـ نێر و مێ بە شێوەیەکی یەکسان، ئیسلام جەختی کردووەتەوە لە گرنگیپێدان و بایەخپێدانیان، بەڵام مێ لە سەرووی ئەوەوە تایبەتکراوە و لە هەندێک بارودۆخ زیاتر جەختکراوەتەوە لە گرنگیپێدان و بایەخپێدانی مێینە بەتایبەت.

لە هەندێک لەو بوار و بارودۆخانەی کە نێر و مێ تێیدا هاوبەشن ئیسلام لەسەرووی ئەوەشەوە، ئافرەتی تایبەت کردووە و زیاتر بایەخی پێ داوە، نەک لە

ڕووی حوکمەوە، بەڵکوو لە ڕووی ئامۆژگاریکردنی تایبەتەوە، ئامۆژگارییە توند و جەخت لێکراوەکانی پەیوەست بە ئافرەت لەو شوێنانەی کە لەگەڵ پیاودا هاوبەشە. زیاترە، ئەمەش پێگەی ئافرەت لەم ڕووەوە بەشێوەی تایبەت دەردەخات.

دوو نموونە لەسەر ئەم زیاتر جەختکردنەوەیە بە گرنگیدان و بایەخپێدانی مێینە، کە نموونەیەکیان بۆ ئەو کاتەیەتی کە منداڵە و نموونەیەکی تر بۆ ئەوکاتەی کە گەورەیە.

نموونەی یەکەم: لەکاتی منداڵیدا، لە سەحیحی بوخاری لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) چەسپاوە کە فەرموویەتی: «من يلي من هذه البنات شيئا، فأحسن إليهن، كن له سترا من النار.» [بوخاری: ٥٩٩٥] واتا: «هەر کەسێک خودای گەورە کچی پێ ببەخشێت و لەگەڵیان چاک بێت، ئەوا دەبنە پارێزەر بۆی لە ئاگری دۆزەخ.» هەروەها هەندێک دەقی دیکە هەر لەم بوارەدا هاتوون. بەڵام زانیاریم نییە بە شتێک کە ئاوا بەتایبەت هاتبێت بۆ چاکەکردن لەگەڵ نێردا بەتایبەتی، کە ئەمەش لقە بۆ بنچینەکە، لە بنچینەدا هاوبەشن لە بایەخپێدان و چاودێریکردنیان و چاکەکردن لەگەڵیان، هەردوولا لەو شوێنی گرنگیپێدانەن کە مرۆڤ دەیخوازێت، دواتر لەدوای ئەمە، چاکەی زیاتر هەیە بۆ کچان بۆئەوانەی کچیان هەیە، کە دەبێتە پارێزەرێک بۆی لە ئاگر!

نموونەی دووەم: لەکاتی گەورەیی یاخود کاتی دایکایەتی بە بە شێوەیەکی گشتی، ئەوەتا لە فەرموودەیەکی مەشهوردا: «من احق الناس بحسن صحابتي؟ قال: أمك. قال: ثم من؟ قال: أمك. قال: ثم من؟ قال: أمك. قال: ثم من؟ قال: أبوك.» [بوخاری: ٥٩٧١] سێجار دایک دواتر جارێک باوک.

ئەمە لقێکە لە بنچینەکە ـوەکوو وتمـ ئێمە لێرەدا لە بابەتی ئافرەت دەڕوانین، لەلایەنی تایبەتەوە، واتا لقێکی زیاتر لە بنچینە هاوبەشەکەی نێوان نێر و مێ. بەڵام ڕوونە کە هەموو دەقەکانی چاکەکردن لەگەڵ دایباب بەسەر هەردووکیان باوک و دایکیشدا جێبەجێ دەبێت. دواتر کە ئەم دەقە تایبەتەی پەیوەست بە مێ دێت، بایەخدان بە مێ زیاتر دەکات، ئایا ئەمە لایەنێک نییە کە بیکەین بە بەڵگە بۆ پێگەی ئافرەت لە ئیسلامدا؟ بەڵێ، لایەنێکە لە گرنگترین لایەنەکان کە دەکرێت بە بەڵگە بیهێنینەوە، وەکوو لقێک لە بنچینەکە، نەک ئەوەی خۆی بنچینە بێت.

٣ـ لایەنی سێیەم: حەڕامی باسکردن و زبر و توندکردنی سزای ئەوەی بوختانیان بۆ دەکات.

ئەو ئایەتەی کە هاتووە بۆ حەددی بوختان بە دەستەواژەی مێ هاتووە: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ لُعِنُوا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٢٣﴾﴾ [النور: ٢٣]. واتا: «بە ڕاستی ئەوانەی ئافرەتانی ئیمانداری پاک داوێن و خاوەن مێرد و بێئاگا لە گوناهـ تۆمەتبار دەکەن، ئەوانە نەفرەتیان لێ کراوە لە دونیا و لە قیامەتدا و سزایەکی گەورە و سەخت ئامادەیە بۆیان (لە تۆڵەی لەکەدار کردنی پاکاندا)...» بەڵام بەم شێوەیەمان نییە: «الذين يرمون المحصنين» هەرچەندە کۆدەنگی زانایانی لەسەرە کە ئەم حوکمە تایبەت نییە بە ئافرەت، هەربۆیە ئیبن جوزی ـڕەحمەتی خودای لێ بێت.ـ دەفەرمووێت: «(المحصنات) مەبەست پێی ئافرەتە داوێنپاکەکانە، لەبەرئەوەش تایبەتی کردووە بەوانەوە، لەبەرئەوەی بوختانکردن بەوان زیاتر بەدڕەوشتیترە وەک لە پیاوان، هەروەها پیاوانیش دەگرێتەوە بەو واتایەی کە جیاوازییان نییە، هەربۆیە زانایان کۆکن لەسەرئەوەی حوکمی پیاوان و ئافرەتان لەم ئایەتەدا یەک شتە.»

بۆچی لە ئایەتێک زیاتر بەدەستەواژەی مێ هاتووە؟ چونکە کەوتنە نێو ئەم کێشەیە لە ئافرەتدا بوغزێنراوتر و خراپترە، بۆیە پێت دەڵێت ئاگاداریە. هەرچەندە ئەگەر بە پیاویش بڵێیت هەرهەمان حەددت لەسەر جێبەجێ دەکرێت کە لەسەر ئافرەت جێبەجێ دەکرێت، بەڵام بابەتەکە لە ئافرەتدا بوغزێنراوتر و خراپترە.

هەربۆیە کاتێک پێغەمبەر (ﷺ) باسی حەوت کاری ناشیرین دەکات «اجتنبوا السبع الموبقات»[1] کە فەرموودەیەکی ترسناکە! چونکە ئەو کارانەی لەخۆ گرتووە کە گەورەترینی تاوانە گەورەکانن، بە هاوبەشدانان دەست پێ دەکات و ئەم بابەتەی ئێمەش لەخۆ دەگرێت «وقذف المحصنات الغافلات» بوختانکردن بۆ ئافرەتانی چاکەکاری بێئاگا لە تاوان.

٤ـ حوکمە تایبەت کراوەکان کە ئیسلام بۆ پاراستنی ئافرەت بڕیاری لەسەر داوە.

زیاتر لە شوێنێک، یاخود بابەتێکی هەڵاوێردوو لە ڕووی پارێزگاریکردنی تایبەت بە ئافرەتان هاتووە کە ئەمەش پێگەی ئافرەت دەردەخات وەکوو ئەوەی لە حوودەیبیەدا ڕوویدا: کاتێک مەرجەکان لەنێوان پێغەمبەر (ﷺ)و هاوبەشدانەرانی قوڕەیش دانران، کە ئەوەی لەخۆ گرتبوو هەر پیاوێکی هاوبەشدانەر موسڵمان بوو و هات بۆ مەدینە بگەڕێنرێتەوە. کە ئەمەش مەرجێکی قورس و دژوار بوو بۆ موسڵمانان. لەو بارودۆخە بوون، کاتێک ئەبوو جەندەلی کوڕی سوهەیل، کە لە مەککە دەستبەسەرکرابوو لەلایەن باوکییەوە، چونکە موسڵمان بووبوو. لەکاتی ڕێکەوتنەکە لە ماڵەوە هەڵهاتبوو و خۆی گەیاندبووە شوێنی ڕێکەوتنەکە.

---

(١) عن أبي هريرة رضي الله عنه، عن النبي صلى الله عليه وسلم قال : "اجتنبوا السبع الموبقات ". قالوا : يا رسول الله، وما هن ؟ قال : " الشرك بالله، والسحر، وقتل النفس التي حرم الله إلا بالحق، وأكل الربا، وأكل مال اليتيم، والتولي يوم الزحف، وقذف المحصنات المؤمنات الغافلات ". پێشەوا بوخاری گێڕاویەتییەوە بە ژمارە (٢٧٦٦)

پێش ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) و سوهەیل ڕێکەوتنەکە واژوو بکەن، ئەبوو جەندەل گەیشتە ئەوێ. دواتر پێغەمبەر (ﷺ) بە داواکردنێکی تایبەت داوای لە سوهەیل کرد کە ڕێگە بدات ئەبوو جەندەل لەگەڵ خۆیان ببەن، بەڵام سوهەیل ڕەتی کردەوە و وتی ئێمە ڕێکەوتنمان کردووە، گەر نەیگەڕێننەوە بۆمان ئەوە ڕێکەوتنەکە هەڵدەوەشێنینەوە. بەمشێوەیە بوو پیاوێک موسڵمان بووایە دەیانگەڕاندەوە.

هەر لە سەردەمی ئەو ڕێکەوتنەدا بوو کە هەندێک ئافرەتی باوەڕدار لە مەککەوە پیاوەکانیان جێهێشتبوو و کۆچیان کرد، خۆیان گەیاندە شاری مەدینە بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ)، کە ئەوکات هێشتا بەندێکی ڕێکەوتنەکە هەڵنەوەشابووەوە. دەگێڕنەوە کە پیاوەکانیان هاتن داوایان کرد ئافرەتەکانیان بۆ بگەڕێننەوە، بەڵام هەر لەو کاتەدا خودای گەورە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ و هەڵاوێردوو بڕیاری دا کە نابێت ئەو ئافرەتانە بۆ بێباوەڕان بگەڕێنرێنەوە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا جَاءَكُمُ الْمُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ فَامْتَحِنُوهُنَّ ۖ اللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِهِنَّ ۖ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَاتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى الْكُفَّارِ ۖ لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ ۖ﴾ [الممتحنة: ١٠]، واتا: «ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە کاتێک ئافرەتە ئیماندارەکان کۆچ دەکەن و دێن بۆ لاتان تاقیان بکەنەوە و بەوردیی پرسیاریان لێ بکەن سەبارەت بە کۆچ و هۆی هاتنەکەیان، خوا ئاگادارە بە ئیمانەکەیان، جا ئەگەر زانیتان باوەڕدارن، ئەوە مەیانگێڕنەوە بۆ لای مێردە بێباوەڕەکانیان، نە ئەم ئافرەتە حەڵاڵی ئەو بێباوەڕانەن، نە ئەو بێباوەڕانەش حەڵاڵن بۆ ئەم ئافرەتە ئیماندارانەن.»

ئەمەش بەشداریکردنێکی ڕاستەوخۆی خودایی بوو بە بڕیاردانی حوکمێکی تایبەت بۆ پاراستنی ئافرەت.

**٥ـ ئەو حوکمە ئاسانکراو و ڕەچاوکراوانەی کە تێیدا لایەنی لاوازی ئافرەتی ڕەچاوکراوە**

هەر بەو بۆنەیە ئەمە تایبەت نییە بە حوکمە شەرعییەکانی ئافرەتی موسڵمانەوە، بەڵکوو تەنانەت بۆ حوکمە شەرعییەکانی جگە لە ئافرەتی موسڵمان، بۆ نموونە وەکوو ئەهلی زیممە، ئیمامی ئیبنولقەیم لە پەڕتووکەکەی (أحكام أهل الذمة): «سەرانە لەسەر منداڵ و ئافرەت و شێت نییە، کە ئەمەش ڕای هەر چوار مەزهەبەکە و شوێنکەوتوانیانی لەسەرە. ئیبن مونزیر و ئیبن قودامەش دەڵێن وا نازانین زانایان ڕاجیاییان لەگەڵ ئەم ڕایەدا هەبێت.» واتا بابەتی سەرانە تەنیا تایبەتە بە پیاوان، ئافرەتان سەرانەیان لەسەر نییە، کە ئەمەش حوکمێکی تایبەت بە ئافرەتە و زیاتر تایبەتکراوە.

هەروەها ئاسانکاری بۆ ئافرەت کراوە لە بابەتی جیهاد لەپێناوی خوادا، ئەگەرچی هەندێک لە ئافرەتان لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) داوای بەشدارییان دەکرد لە جیهاددا. داوای ئافرەتانیش بۆ بەشداریکردن لە جیهاد و لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ)، لقێکە لەو کارە لە پێشینەییانەی کە لەپێناویدا دەژیان، کاری لە پێشینەیان سەرخستنی ئیسلام و موسڵمانان و سەرکەوتنی هەق و هەڵوەشاندنەوەی باتڵ بوو. کە ئەوەی لە بیر بردبوونەوە لەکاتی جیهادا چیان تووش دەبێت. چونکە ئەو زۆر لەوە لاوازترە کە فەرمانی پێ بکرێت بە وەڵامدانەوەی بابەتێکی وەها.

هەربۆیە ئافرەتان پرسیاریان لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد دەربارەی جیهاد، ئەویش فەرمووی: «جیهادی ئێوە حەجە.»[١] حەجیش وزەیەکی وەهای ناوێت کە

---

(١) عن عائشة أم المؤمنين، عن النبي صلى الله عليه وسلم، سأله نساؤه عن الجهاد، فقال : " نعم الجهاد الحج ". پێشەوا بوخاری گێڕاویەتییەوە بە ژمارە (٢٨٧٦)

زۆر تێبکۆشن بۆی. ئەمەش ئەو ڕادەیە کە دەتوانن پێی هەستن. فەرمانکردن بە ئافرەتیش بۆ جیهاد بابەتێکی زۆر قورسە، واش دەزانم کە سەلماندنی ناوێت، چونکە لە جیهاددا، لەدەستدانی ڕۆح و برینداری و کارەساتی زۆری تێدایە کە تەنیا پیاوان توانای ئەوەیان هەیە. هەربۆیە ئاسانکاری بۆ ئافرەت لەم کاتانەدا، بەشێکە لەو تایبەتکردنەی کە ڕەچاوکردنی ئافرەتی تێدا دەردەکەوێت، لە بنچینەدا هاوبەشن لەگەڵ پیاودا، بەڵام لەهەندێک لایەندا کە قورسی تێدایە لەسەر ئەوان ئاسانکراوە.

هەروەها لە هەندێک حوکمی تایبەت بە حەج، بۆ نموونە دەرچوونی لە ڕۆژی موزدەلیفە، وەکوو دەزانن دەرچوون لە موزدەلیفە ـدەرچوونە لە موزدەلیفەوە بۆ مینا. لەدوای نوێژی بەیانییەوەیە، بەڵام بۆ لاواز و ئافرەتان ڕێگەدراوە کە بەنزیکی لە نیوەی شەودا دەربچن، بۆئەوەی نەکەونە کێشەی قەرەباڵغی و بەرکەوتنەوە.

٦ـ پیاوان بە شێوەیەکی تایبەت ئامۆژگاری کراون دەربارەی مافەکانی ئافرەت، هەروەها باشبوونی زیاتر و مامەڵەی چاکی زیاتر ـلەسەرووی ئەوەی کە ئەرکەـ لەگەڵ ئافرەتدا، کراوە بە پێوەری چاکی و فەزڵبەخشین بە پیاو.

ئەمە ئەگەر لەگەڵیدا لایەنی یەکەممان هێنا: ئەوا دەردەکەوێت بەڕاستی ئەمە شتی زیاترە، شتێکی ئاشکرایە کە ئامۆژگاری تایبەتی زیاتر هەیە دەربارەی ئافرەتان.

بۆ نموونە فەرمان بە ڕەفتاری چاک، خۆ ئەمە تایبەت نییە بە پیاوان جگە لە ئافرەتان، یاخود تایبەت نییە بە ئافرەتان جگە لە پیاوان. ئایا ئەم

فەرمانکردنە بە ڕەفتاری چاک مامەڵەی پیاو لەگەڵ خێزانەکەیدا دەگرێتەوە؟ بەڵێ، دەگرێتەوە، ئەی ئایا مامەڵەی ئافرەت لەگەڵ پیاوەکەیدا دەگرێتەوە؟ بەڵێ، دەیگرێتەوە.

بەڵام کاتێک لەسەرووی ئەمەوە فەرمانی تایبەت و زیاتر کراوە بە ڕەفتاری چاک و دادگەری و ئینساف و ستەم نەکردن و هەروەها بە ئامرازی زۆر و جیاواز پێمان ڕاگەیەنراوە، بە واتای ئەوە دێت زیاتر ئاگادار بن بە نیسبەت ئافرەتانەوە، ئاگادارکردنەوە و ئامۆژگاری زیاتر هاتووە بۆ چاکەکردن لەگەڵیان و خۆپاراستن لە ستەمکردن لێیان و ئازارنەدانیان.

بۆ ئەمەش، زیاتر لە فەرموودەیەکمان هەیە بەم واتایە:

ـ فەرموودەی یەکەم، فەرموودەی جابری کوڕی عەبدوڵڵا، دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) لە حەجیماڵئاویی هەستا و وتاری دا و فەرمووی: «اتقوا الله في النساء،» [سەحیح سونەن ئەبو داود: ١٩٠٥] وتارەکەی وتارێک بوو بابەتی هەمەجۆری لەخۆ دەگرت، کە یەکێک لەو بابەتانە ئەو وتەیەی بوو کە فەرمووی: «اتقوا الله في النساء» لەهەمان وتاردا ئەم وتەیەی دەرهەق بە پیاوان نەفەرموو: «اتقوا الله في الرجال» ئایا مەگەر لەخواترسان لەکاتی مامەڵەکردنی ئافرەت لەگەڵ پیاودا، شتێکی داواکراو نییە؟ بەڵێ، داواکراوە، بەڵام ئەمە ئەو واتایە دەگەیەنێت کە سەرەتا باسم کرد: لە بنچینەدا هاوتان و بابەتی هاوبەش لەسەر هەردوولا هەیە کە پێی هەستن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئامۆژگاری زیاتر و ئاگادارکردنەوەی زیاتر هەیە لەسەرووی ئەوەوە.

بۆ نموونە ئەگەر منداڵەکانم ڕۆشتن بۆ گەشتێکی قوتابخانە، پێیان دەڵێم: «ئاگاتان لە منداڵەکان بێت و توخوا ئاگاتان لە منداڵەکەشم بێت.» ئەمە واتای

ئەوە نییە ئاگاداری منداڵەکانی تر مەبن، بەڵکوو واتای گرنگی دانی زیاتر دەگەیەنێت، هەمان شت بۆ ئافرەتانیش «اتقوا الله في النساء» خۆ ئافرەتانیش دەبێت لە خوا بترسن بەرانبەر بە پیاوەکانیان، بەڵام ئەمە واتای ئاگادارکردنەوە و ئامۆژگاری زیاترە لەسەرووی ئەوەوە.

ـ هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا: «استوصوا بالنساء خيرا» [موسلیم: ٨٦٤١] کە ئەمەش فەرموودەیەکی سەحیحە.

ـ لە فەرموودەیەکی تریشدا، کە فەرموودەیەکی سەرسوڕهێنەرە، کە وا پێویستە پیاوان پێداچوونەوە بەخۆیاندا بکەن و بەپێی ئەم فەرموودەیە ڕیزبەندیکارە لە پێشینەییەکانەکانیان ڕێک بخەنەوە. چونکە ئەم فەرموودەیە پێوەرێکی چاکەی تێدایە، واتا چ شتێک پێوەرە بۆ چاکەی پیاو. لە سوننەی ترمزیدا هاتووە، فەرموودەکەش موحەممەدی کوڕی عومەری کوڕی عەلقەم گێڕاوییەتییەوە لە باوکی سەلەمەوە و ئەویش لە ئەبوو هوڕەیرەوە، کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: «خيركم خيركم لأهله، وأنا خيركم لأهلي» [سەحیح سونەن تورمزی: ٣٨٩٥] ئەم فەرموودەیە بە مرۆڤێک بوترێت کە لە خودا بترسێت و کارە لەپێشینەییەکانەکانی لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) وەرگرتبێت و هەروەها فەزڵدانی لەنێوان ئەرکەکانی و بەرپرسیارییەتییەکانی لەسەر ئەوە بونیادناوە کە پێغەمبەر (ﷺ) بونیادیناوە، دواتر گوێ لە پێغەمبەر (ﷺ)دەگرێت، دەفەرموورێت: «خيركم خيركم لنسائهم» ئەمە هەرگیز شتێکی کەم نابێت بەلایەوە.

بەڵام مرۆڤێک کە سرووش بە گەورە نەگرێت، ئاساییە ڕەفتاری بەوشێوەیە نەبێت، ئەم جۆرە پەیامە بۆ ئەو کەسانەیە کە تێڕوانینەکانی لەسەر سرووش و سوننەت بونیاد دەنێت.

هەربۆیە ئەم فەرموودەیە بەم ئامۆژگاریکردنە و بەم بوون بە پێوەرییە، بە ڕای من لە گرنگترین فەرموودەکانە کە دەکرێت لێیەوە لە پێگەی ئافرەت تێبگەیت لە ئیسلامدا لەلایەنی تایبەتکردنەوە.

کەواتە ئەمانە ئەو لایەنانە بوون کە بە شێوەیەکی تایبەت پێگەی ئافرەتی دەردەخست لە ئیسلامدا. گرنگترین بابەتیش کە دەمەوێت جەختی لەسەر بکەمەوە، پێشەکی یەکەمە، کە لەلایەنی تایبەتکردنی ئافرەت ناتوانیت تێبگەیت مەگەر لەژێر ڕۆشنایی ئەو پێشەکییەوە نەبێت و لە پێگەی ئافرەت تێناگەیت لە ئیسلامدا مەگەر بەهۆی ئەو پێشەکییەوە نەبێت، هەروەها لە دۆسیەی ئافرەت بە شێوەیەکی گشتی تێناگەیت لە ئیسلامدا مەگەر بەهۆی ئەو پێشەکییەوە نەبێت، کە ئەویش: لە بنچینەدا پێگەی ئافرەت لە ئیسلامدا، بە دەرکەوتنی خودی چاکەی ئیسلام و دەرکەوتنی پێگەی خودی موسڵمان پیاو و ئافرەت هەروەها دەرکەوتنی ئەو چاکەیەی کە ئیسلام پاڵی داوەتە لای مرۆڤەوە و ئەو واتایەی کە ئیسلام بۆ مرۆڤی زیاد کردووە، دەردەکەوێت.

هەروەها ئەوەی کە چ جیاوازییەکی گەورە هەیە لەنێوان مرۆڤێک کە لە تاریکایی و مرۆڤێک کە لە ڕووناکیدا دەژیت، مرۆڤێک کە لە گومراییدا و مرۆڤێک کە ئیسلام پێگەی پێ بەخشیوە و لە ڕێنموونیدا دەژیت، ﴿أَفَمَنْ يَمْشِي مُكِبًّا عَلَىٰ وَجْهِهِ أَهْدَىٰ أَمَّنْ يَمْشِي سَوِيًّا عَلَىٰ صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ ﴿٢٢﴾﴾ [الملك: ٢٢]. واتا: «جا ئایا ئەو کەسەی کە دەمەو ڕوو کەوتووە و بەو حاڵەوە دەڕوات، چاکتر ڕێگە دەزانێت؟ یان ئەو کەسەی کە بەسەر شەقامێکی ڕاست و ڕەوان دا بە ڕێک و پێکی دەڕوات بەڕێوە؟!»

ئەم دەقانە و هاوشێوەکانی لە گەورەترین ئەو دەقانەن کە پێگەی ئافرەت

دەردەخەن لە ئیسلامدا، چونکە هەڵەیەکی گەورەیە بۆ چاکە و پێگەی ئافرەت لە ئیسلامدا، بەتەنیا لەو دەقانەدا بگەڕێین کە باسی ئافرەت، یان دایک، یاخود کچی تێدا هاتووە. نەخێر، بەڵکوو ئەو دەقانەش کە باس لە خودی ئیسلام و چاکە و پێگەی دەکەن، هەروەها ئەوانەی باسی گومڕایی و تاریکی و سەرگەردانی و کێشە دەکەن کە تووشی مرۆڤێک دەبێت کە لەدەرەوەی ئیسلامە، هەموو ئەمانە دەرخەری پێگەی ئافرەتن لە ئیسلامدا.

# چەند پێشەکییەک دەربارەی ئافرەت لە کۆمەڵگەی پێغەمبەریدا (ﷺ)

١ـ ئەم بابەتە گرنگە لە ڕووی دۆزینەوەی نموونە و پێشەنگ، یاخود ئاگاداربوون لە نموونەی ڕاست و دروست.

ئێمە پێشەکییەکی زانستی گرنگمان هەیە، کە ئەویش: دروستکردنی نموونە و پێشەنگێکی دروست و دەرخستنی، بەسوودترە لە بوغزاندن و پووچەڵکردنەوەی نموونە و پێشەنگێکی هەڵە. ئەگەرچی هەر گرنگە وەڵامی نموونە هەڵەکانیش بدرێتەوە، بەڵام کێشەکە ئەوەیە هێرش بکرێتە سەر لایەنی ناڕاست بەبێ دەرخستنی نموونەیەکی دروست لەبەرانبەریدا. هەربۆیە جەخت خستنە سەر ئافرەت لە کۆمەڵگەی پێغەمبەریدا (ﷺ) و دوای پێغەمبەریش (ﷺ)، بەشێکە لە دەرخستنی نموونە.

٢ـ بارودۆخی ئافرەت لە کۆمەڵگەی پێغەمبەریدا (ﷺ)، بارودۆخێکە کە ئافرەت ڕۆڵی فراوانی گێڕاوە و هەروەها نموونە و پێشەنگی زۆری تێدا بەرهەم هاتووە.

بە جۆرێک ئەگەر ئەو فەرموودانە یاخود ئەو بارودۆخانەی کە ئافرەتی تێدا هاتووە و هەروەها ڕۆڵی ئافرەت لە ژیاننامەی پێغەمبەر (ﷺ) و سوننەتەکانی بسڕینەوە، ئەوا نوقسانییەکی زۆر گەورە ڕوو دەدات، ئەو وتەیەش وڕاوە نییە، بەڵکوو خودی ئەو باروودۆخە بوو کە بوونی هەبوو.

من سەرم سوڕ دەمێنێت! پێش ماوەیەک کە باسی ئافرەتم کرد و وتم ڕۆڵی مەزنی هەیە لە بانگەوازدا و ... تاد. لەولاوە بەناوی شەریعەتەوە هێرش دەکرێتە سەرم و، دەڵێن: «ڕێزی خۆت بگرە! ئافرەت شوێنی ماڵەوەیە و ... تاد.» باشە ئافرەت لەماڵە و بابەتی دەرچوونی ئافرەت و سنوورەکانی و ڕێساکانی ئەمە بابەتێکی شەرعییە و گفتوگۆی لەسەر دەکرێت، بەڵام کاتێک قسە لەسەر ڕۆڵی ئافرەت دەکەین، پانتاییەکەی فراوانە و تۆ نەزانی پێی. خۆ ئەگەر وا بزانی ئەوەی بڕوات پێیەتی هەقە، ئەوا تۆ نەزانی.

بۆیە لێرەدا ئەو ڕۆڵ و پانتاییەمان ڕێک خستووە و باسی دەکەین، بۆئەوەی وێنەکە نزیک بخەینەوە لە خوێنەر.

٣ـ بارودۆخی ئافرەت لە کۆمەڵگەی پێغەمبەردا (ﷺ)، بەتایبەتی لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) و سەرپەرشتیکردنی خودی خۆی بارودۆخێکە کە دانایییەکی زۆر مەزنی تێدا بەدی دەکرێت.

بارودۆخی دانایی بە واتای: کە سەیری ئەو واقعەی ئەمڕۆ دەکەیت کە بوونی هەیە لە ڕووی داخران و توندێتییەوە و دواتر بە بارودۆخی کۆمەڵگەی پێغەمبەری (ﷺ) دەپێویت، دەبینیت جیاوازییەکی گەورە هەیە. هەندێک جار ئەم توندی و داخرانەش، بە نییەتی چاکە یاخود خەیاڵی زانیاری، مرۆڤ وا بزانێت کە هەق ئەوەیە کە لەسەرییەتی، هەندێک جاریش بەهۆی باڵادەستبوونی نەریتی کۆمەڵایەتی و ئارەزووی کەسییەوەیە.

لە ڕوویەکی تریشەوە و لە بەرانبەر ئەو داخران و توندێتییە، واقعێک هەیە کە نە ڕەچاوی بەڵاکانی نێوان پیاوان و ئافرەتان دەکات و نە ئاوڕیشیان لێ دەداتەوە، بەسانایی بابەتەکەی وەرگرتووە. ئەم واقعەی کە باسی دەکەم

تەنانەت واقعی ئیسلامی ئەمڕۆش دەگرێتەوە، سا ئیتر ئەم جۆرە لە واقعیش، لە ئەنجامی توندی و داخران بێت کە هەیە، یاخود هەڵە تێگەیشتن و ملکەچی بۆ گوشاری واقعەکە، یاخود هەرشتێکی دیکە بێت. هەروەها هەندێک جار تێڕوانینی کرانەوە و بەسانایی وەرگرتنی بابەتەکەیان پەیوەست کردووە بە وێستگەیەک لە وێستگەکانی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ). ئافرەت لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) سوپاس بۆ خودا لە کرانەوەدابوون و وا و وا، بەڵام لایەنی ڕێساکان فەرامۆش دەکات کە بوونیان هەبوو.

بۆیە کە تۆ وێنەیەکی گشتی کۆمەڵگەی پێغەمبەری (ﷺ) وەردەگریت، دەبینیت کە بارودۆخەکە بارودۆخێکی داناییە، کە نهێنی داناییەکەش ئەمەیە: تەشریعێکی ڕێکخراو و ئامانجێک بوونی هەیە، کە کۆمەڵگە لەپێناویدا تێدەکۆشێت، لق و وردەکارییەکانیش کە وا دەبینرێت دژیەک بن دەڕژێنە ناو ئامانجێکەوە کە لەوان گەورەترە.

٤ـ ئاگادارکردنەوەیەکی زانستی: شوێنکەوتنی پێغەمبەر (ﷺ) ـچ لە بابەتی ئافرەت بێت، یاخود جگە لەو- دەبێت شوێنکەوتنێک بێت مەبەستی تێدا ڕەچاو بکرێت و تەنیا لە چوارچێوەی وشە و ڕووکەشدا کورت هەڵنەیەت.

واتا هەندێک جار لە بابەتی ئافرەتدا، شتانێک دێنە پێشەوە و پێت دەڵێن: «من بەدیاریکراوی لەم بابەتەدا شوێن پێغەمبەر (ﷺ) دەکەوم.» بۆ نموونە جگە لە بابەتی ئافرەت، بابەتی پۆشاک: پێغەمبەر (ﷺ) پۆشاک و عابایەکی لەبەر دەکرد، یەکێک لەولاوە دەڵێت: «من پێغەمبەرم (ﷺ) خۆش دەوێت و دەمەوێت ئەمڕۆ شوێنی بکەوم، بۆیە پۆشاک و عابا لەبەر دەکەم وەکوو شوێنکەوتنێک بۆ پێغەمبەر (ﷺ).» ئەم شوێنکەوتنە مەبەستی تێدا ڕەچاو نەکراوە، ئەو مەبەستەی کە لە شوێنەکەوتنی پێغەمبەردایە (ﷺ)لە بابەتی

پۆشاکدا ئەوەیە: ئەو پۆشاکەی کە لە کۆمەڵگەکەتدا باوە ئەوە بپۆشیت.

هەربۆیە شوێنکەوتنی ئەو بارودۆخەی کە پێغەمبەری (ﷺ) لەسەر بووە، شوێنکەوتن نییە بە کۆپیکردنی خودی وشەکان و جێبەجێ کردنیان لەمڕۆدا.

**٥ـ هاوبەشبوونی کۆمەڵە وشەیەک لەنێوان واقعی ئەمڕۆ و واقعی ئافرەت لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ)، بە واتای هاوبەشبوون نییە لە هەموو شێوەکانی ئەم وشەیە.**

کاتێک دەڵێین: «پیشەی ئافرەت لەمڕۆدا» شێوازێکی دیاریکراو، یاخود نموونەیەکی دیاریکراو، یان پێویستییەکانی پیشەیەکی دیاریکراو بۆ ئیشی ئافرەت دێت بە بیردا.

کاتێک ئێمە دەڵێین: «پیشەی ئافرەت لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ)» و هەندێک نموونە دەهێنینەوە، دەبێت تێبگەیت بابەتە، وشەیەک نییە هاوتای وشەیەکی دیکە بێت؛ کە مادام ئافرەت لەو سەردەمەدا کاری کردووە با ئەمڕۆش بە شێوازی ئەمڕۆ کار بکات ئیتر هەر شێوازێک بێت گرنگ ئەوەیە کارێکی جێگیری هەبێت، بە بیانووی ئەوەی ئێمە باسی ئەوە دەکەین کە لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) ئافرەت پیشەی هەبوو. بەڵکوو دەبێت لەگەڵیدا گرنگی بەمەبەستی ئەو پیشەیە بدرێت کە باس دەکرێت، لەگەڵ هەر پیشەیەکیشدا ڕەچاوی ڕێسا و سنوورەکانیش بکرێت.

**٦ـ ئەو بابەتە گشتییانەی کە ئافرەتان بایەخیان پێ دەدات لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ)**

**٧ـ ڕێگای دروست و زانستی ئەوەیە کە ئەو بەشانەی دەربارەی وردەکاری ئافرەت هاتوون لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ)، کۆیان بکەیتەوە و ئەو بابەتە**

مەزنانەی لێ هەڵبهەنجێنیت کە پێیەوە سەرقاڵ بوون لەگەڵ ئەوەی خودی ئەم بابەتانەش چی لەخۆدەگرن، نەک بەشبەشکردن و قایلبوون بەهەندێک بەش و وردەکاری کە لەو بارەیەوە هاتوون.

کاتێک دەڵێین: «بابەتە مەزنەکان»، ئەوا قسە لەسەر گرنگترین بابەتە مەزنەکان دەکەین، ئەوەمان لەلا مەبەست نییە کە جگە لەمانە ئافرەت بە هیچ شتێکی ترەوە خەریک نەبوو بێت.

هەروەها لەیادیشمان نەچێت، کاتێک دەڵێین سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)، ئەوا قسە لەسەر قۆناغی یەکەمی ئیسلام و سەردەمی سەرقاڵبوون بە بونیادنانی کۆمەڵگەی موسڵمان و گەیاندنی پەیامی خودا و بڵاوکردنەوەی ئەم ڕووناکییە دەکەین. سروشتییە کە لادان لەسەر ئەم بارودۆخە ئاساییەش ڕووی دابێت لەنێو ئەو کۆمەڵگەیەدا، کە هەندێک نوقسانی و هەڵەیان هەبووە و پێغەمبەر (ﷺ) بۆیانی چارەسەر کردووە.

ئەوەی من تێبینیم کردووە سێ بابەتی مەزن هەیە، کە ئافرەتان پێیەوە سەرقاڵ بوون لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ):

١ـ هەوڵدان بۆ فێربوونی زانست: مەبەست لێرەدا ـبە دیاریکراوی ـ فێربوونی ئایین و تێگەیشتنە لێی بەو شێوەیەی کە لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) هەبووە.

٢ـ گوێڕایەڵی و وەڵامدانەوەی داواکارییەکانی زانست، کارکردن بە زانست، هەروەها جێبەجێکردنی زانست بە شێوەیەکی کردەیی.

بەڵێ، ئەم بابەتە بوو کە سەرقاڵیانی دەکرد و بابەتی مەزنیان بوو، بە واتای ئەوەی فێربوون و زانست لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) بەتەنیا بابەتێکی

زانیاری خاڵی نەبوو لەو جێبەجێکردنانەی کە زانستەکە کە دەیخواست، بێگومان ئەمەش وێنەدانەوەی پەروەردەی پێغەمبەر (ﷺ) بوو بۆیان.

٣ـ سەرخستنی ئامانج و مەبەستە مەزنەکە. لەو سەردەمەدا کارێکی هاوبەشی نێوان پیاوان و ئافرەتانی هاوەڵی پێغەمبەر (ﷺ) بوو کە ئەو ئامانج و مەبەستەش سەرخستنی پێغەمبەر (ﷺ) و ئیسلام بوو ـخۆی ئەم بابەتە بەشێکە لەو وەڵامدانەوانەی کە بۆ ئەو زانستەی فێری دەبوون، هەیان بوو، بەڵام بەهۆی زۆری گەواهییەکان لەسەر خودی ئەم بابەتە، کردوومانە بە بابەتێکی سەربەخۆ..

ڕەنگە ئەم بابەتی سێیەمە، مەزنترین بابەت بێت کە ئافرەت پێیەوە سەرقاڵ بوویێت لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ).

ـهەربۆیە ئەگەر بمانەوێت لەمرۆدا قسە لەسەر شوێنکەوتنی پێغەمبەر (ﷺ) و وەڵامدانەوەی ئافرەتە باوەڕدارەکان بۆ ئایین، ئەو ئافرەتانەی کە بابەتی ئایین و ئەو ئامانجەی بۆی دروستکرا بوون خەم و مەراقیان بوو، بکەین. ئەوا ڕۆشنایی خستنەسەر ئەم بابەتە مەزنانە و هەوڵدانمان بۆ بەدیهێنانی ڕۆڵی ئافرەت لەم لایەنە مەزنانەدا، پێم وایە ئەم بابەتە لە باشترین و لە زۆرترین شێوەکان کە دەکرێت شوێنکەوتنی پێغەمبەر (ﷺ) و سوودبینین لە قوتابخانەکەی لەڕێگەیەوە بەدی بهێنین.

## گەواهی و چەند نموونەیەک بەخێرایی

ئەمە ئەو سێ بابەتە مەزنە بوو کە باسمان کرد، ئێستاش باس لە گەواهییەکان دەکەین بۆ هەریەک لەم سێ بابەتە مەزنە. لێرەدا گەواهییەکان بەخێرایی باس دەکەین و دواتر لە شوێنی دیکە وردەکاری و قسەی لەسەر دەکەین، گەواهییەکان:

١ـ ئافرەتێکی ڕەشپێست کە تووشی پەرکەم دەبوو:[1] ئەم بەسەرهاتە سەحیحە و لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە کە لە سەرسوڕهێنەرترین چیرۆکەکانە. ئافرەتێکی ڕەشپێست کە تووشی پەرکەم دەبوو، هات بۆ لای پێغەمبەری خودا (ﷺ) و پێی وت: «ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) من تووشی پەرکەم دەبم و ئەوەم لێت دەوێت کە لەخودا بپاڕێیتەوە بۆم.» پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: «ئەگەر بتەوێت و ئارامبگری ئەوا بەهەشتت بۆ هەیە، خۆ ئەگەر بشتەوێت بۆت دەپاڕێمەوە لە خودا.» ئافرەتەکە وتی: «ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) بەڵکوو ئارام دەگرم، بەڵام من کە تووشی پەرکەم دەبم، هەندێک لە جەستەم دەردەکەوێت، لە خودا بۆم بپاڕێرەوە کە جەستەم دەرنەکەوێت.» پێغەمبەریش (ﷺ) لەخودا پاڕایەوە بۆی.

بەڵێ، ئەم ئافرەتە ئارامگرتنی پێ باشتر بوو لەسەر ئەم بەڵایە، بە ئومێدی چوونە بەهەشت. ئەگەرچی پێغەمبەر (ﷺ) بۆی بپاڕایەتەوە خۆ هەر دەچووە بەهەشت. بۆیە ئەمە بەتەنیا باروودۆخێک نییە، بەڵکوو بیرۆکەکە ئەوەیە کە

---

(١) «عن عطاء بن أبي رباح، قال: قال لي ابن عباس: ألا أريك امرأة من أهل الجنة؟ قلت: بلى. قال: هذه المرأة السوداء، أتت النبي صلى الله عليه وسلم، فقالت: إني أصرع، وإني أتكشف، فادع الله لي. قال: " إن شئت صبرت ولك الجنة، وإن شئت دعوت الله أن يعافيك ". فقالت: أصبر. فقالت: إني أتكشف، فادع الله أن لا أتكشف. فدعا لها.» پێشەوا بوخاری بە ژمارە (٥٦٥٢) و، پێشەوا موسلیم بە ژمارە (٢٥٧٦) گێڕاویانەتەوە.

پێشتر لەسەر گوایڕایەلی و وەڵامدانەوە بۆ بابەتە مەزنەکان و پێشخستنیان بونیادنراون، بە جۆرێک ئامادە بوو هەموو تەمەنی بەم بەڵایەوە بەسەر ببات کە پەرکەمە. لەبەردەم خەڵکیشدا بکەوێت، وەکوو گوێڕایەڵییەک بۆ وتەی پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرمووی: «بەهەشتت بۆ هەیە ...»

لەوانەیە ئەم مەوقیفە وەکوو مەوقفێکی ئاسایی، یاخود مەوقفێک لەسەر فەزڵی ئارامگری وەربگیرێت، بەڵام بەلای منەوە ئەم مەوقیفە تەواو جیاوازە، ئەم مەوقیفە بەڵگەیە لەسەر ئەو بابەتە مەزنەی کە باوەڕدار لەو سەردەمەدا پێیەوە سەرقاڵ بوو، ئەویش: دەستەبەرکردنی گوێڕایەڵی بوو بۆ فەرمانی خودا و وەڵامدانەوە و ملکەچبوون بوو بۆی و بەدەستهێنانی بەهەشت بوو.

٢- لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە کە ئەبوو سەعیدی خودری، دەڵێت: «وكان أكثر من يتصدق النساء» [موسلیم: ٨٨٩] واتا: «زۆرترین کەسانێک کە خێر و چاکەیان دەکرد، ئافرەتان بوون.» کە ئەمەش وێنەیەکە لە وێنەکانی گوێڕایەڵی و وەڵامدانەوە.

٣- لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە، کە ئافرەتان بە پێغەمبەریان (ﷺ) وت: «ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) وا دەبینین کە جیهاد باشترین کار بێت، ئایا ئێمەش جیهاد نەکەین؟» پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: «لا، لكن أفضل الجهاد حج مبرور.» [بوخاری: ١٥٢٠] واتا: «نەخێر، بەڵام باشترین جیهادی ئێوە حەججە.» سا سەرنجی ئەو بابەتانە بدەن کە سەرقاڵی کردبوون، پاڵنەریان بوو، هاندەریان بوو، جووڵێنەریان بوو.

٤- پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: «خەڵکانێکم پیشاندرا لە ئوممەتەکەم، کە سواری کەشتی دەبن لەم ڕووبارەدا، بە مەبەستی غەزا لەپێناوی خودادا»

ئوم حەڕامیش وتی: «ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) داوا لە خودا بکە کە منیش بخاتە ڕیزی ئەوانەوە.»[1] بەڵێ، ئەمە ئەو بابەتانە بوون کە ئافرەتان مشووریان دەخوارد و پێیەوە سەرقاڵ بوون.

## ئەو ڕۆڵانەی کە ئافرەت هەیبوو لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ)

### ڕۆڵی یەکەم: پشتیوانی و کۆمەکیکردنی بانگخواز و چاکەکاران و هەروەها لەخۆگرتنیان لە ڕووی دەروونی و مەعنەویی و بەرهەستییەوە.

ئەمە گەورەترین ڕۆڵە کە ئافرەتان لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) پێی هەستاون و دەچێتە چوارچێوەی سێیەم بابەتی مەزنەوە: «سەرخستنی ئایین و پێغەمبەر (ﷺ)» ـوشەی «بانگخوازان» و «چاکەکاران»م بە شێوەیەکی گشتی بەکارهێناوە، ئەگینا لەو سەردەمەدا: پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵان بوون..

کۆمەڵێک نموونە لەسەر ئەم ڕۆڵە:

١ـ دایکە خەدیجە و پشتیوانیکردنی لە پێغەمبەر (ﷺ). ئەگەر بە شێوەیەکی ورد باسی ئەم بابەتە بکەین، پێویستی بە بابەتێکی تەواو هەیە، بەڵام سوپاس بۆ خودا ڕۆڵی دایکە خەدیجە لای کەس شاراوە نییە. کە

---

(١) «عن أنس بن مالك رضي الله عنه، قال: حدثتني أم حرام، أن النبي صلى الله عليه وسلم قال يوما في بيتها، فاستيقظ وهو يضحك، قالت: يا رسول الله، ما يضحكك؟ قال: "عجبت من قوم من أمتي يركبون البحر كالملوك على الأسرة". فقلت: يا رسول الله، ادع الله أن يجعلني منهم. فقال: "أنت معهم". ثم نام فاستيقظ وهو يضحك، فقال مثل ذلك مرتين أو ثلاثا، قلت: يا رسول الله، ادع الله أن يجعلني منهم. فيقول: "أنت من الأولين". فتزوج بها عبادة بن الصامت، فخرج بها إلى الغزو، فلما رجعت قربت دابة لتركبها، فوقعت فاندقت عنقها» پێشەوا بوخاری گێڕاویەتییەوە بە ژمارە (٢٨٩٥)

دیارترین ڕۆڵەکانی لە سەخترین قۆناغی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) بووە، کە ئەویش سەردەمی قۆناغی مەککی بوو.

٢- ڕۆڵی فاتیمە کاتێک هاوبەشدانەرانی قوڕەیش پاشماوەی ئاژەڵی سەربڕدراویان خستەسەر سەری پێغەمبەر (ﷺ)، فاتیمە هەستا بە لابردنی.

ئیبن مەسعوود لەو دیمەنەدا ئامادەیی هەبوو، ئەم فەرموودەیەش کە ئیبن مەسعوود باسی کردووە سەخترین شتە کە دەربارەی بەڵا و ناڕەحەتی و ستەم بگێڕدرێتەوە و هەروەها لە قورسترین شتەکانە کە بتوانرێت وێنەی سروشتی ئەو بەڵایە بکرێت، کە لەو سەردەمەدا هەبووە. ئیبن مەسعوود باسی دەکات کە هاوبەشدانەران پاشماوەی ئاژەڵیان کردە سەر سەری پێغەمبەر (ﷺ) لەکاتێکدا لە سوژدە دابوو، ئیبن مەسعوود دەڵێت: «من وەستابووم دەمڕوانی ئایی ئەگەر دەسەڵاتم هەبوایە ئەوا لام دەدا لەسەر سەری پێغەمبەری خودا (ﷺ).»[1] واتا لەو کاتەدا و دوای ئەوەش نەمدەتوانی هیچ بکەم ... فاتیمە هاتوو ئەو ئازارەی لەسەرسەری لابرد.

بێگومان هاوبەشدانەرانی قوڕەیش نەریتیان هەبوو، کە ئەمە ئافرەتە و ڕەچەڵەکی هەیە بۆیە هیچیان نەکرد.

بەڵام واتای ئەم کارەی فاتیمە ئەوەیە کە ئافرەتان چاودێری و بایەخدان

---

(١) «أن عبد الله بن مسعود حدثه أن النبي صلى الله عليه وسلم كان يصلي عند البيت وأبو جهل وأصحاب له جلوس، إذ قال بعضهم لبعض : أيكم يجيء بسلى جزور بني فلان، فيضعه على ظهر محمد إذا سجد ؟ فانبعث أشقى القوم، فجاء به فنظر حتى سجد النبي صلى الله عليه وسلم، وضعه على ظهره بين كتفيه، وأنا أنظر لا أغير شيئا، لو كان لي منعة، قال : فجعلوا يضحكون، ويحيل بعضهم على بعض، ورسول الله صلى الله عليه وسلم ساجد لا يرفع رأسه، حتى جاءته فاطمة فطرحت عن ظهره، فرفع رأسه، ثم قال : اللهم عليك بقريش - ثلاث مرات، فشق عليهم إذ دعا عليهم،» پێشەوا بوخاری گێڕاویەتییەوە (٢٤٠)

و تێگەیشتنیان هەبوو بۆ گرفت و ئاڵنگارییەکان، دانەبڕا بوون نە لە واقعی بانگەواز، نە لەو ئاڵنگارییانەی کە بانگخواز و چاکەکار پێیدا تێدەپەڕین، بۆیە هات و ئەو ئازارەی لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) لابرد.

٣ـ فەرموودەیەکی گرنگ و مەرکەزییە لەم بابەتەدا، لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە، کە ئوم عەتییە دەڵێت: «غزوت مع رسول الله صلى الله عليه وسلم سبع غزوات أخلفهم في رحالهم، فأصنع لهم الطعام، وأداوي الجرحى وأقوم على المرضى» [موسليم: ١٨١٢] واتا: «لەگەڵ پێغەمبەری خودا (ﷺ) بەشداری حەوت غەزام کردووە، دوایان دەکەوتم و خواردنم بۆیان دروست دەکرد و چارەسەری برینەکانیانم دەکرد و هەروەها خزمەتی نەخۆشەکانیانم دەکرد.»

٤ـ ئوم سولەیم و پشتیوانی و دڵدانەوەی ئەبوو تەڵحەی مێردی لەکاتی مردنی کوڕەکەیاندا، کە زۆر خۆشی دەویست. کاتێک مرد ئوم سولەیم دڵی مێردەکەی ڕادەگرت بەڕاگرتنێکی زۆر و ڕازی دەکرد کە ئارام بگرێت، دەیوت: «ئەگەر هۆزێک ئامانەتێکیان لای هۆزێکی تر دانا، دواتر هاتن و داوایان کرد، ئایا دەبێت ڕێگرییان لێ بکرێت؟ ئەبوو تەڵحەش وتی: «نەخێر.» ئوم سولەیمیش وتی: «دەی هەر وەها حسابکە بۆ کوڕەکەتیش ...»[1] .کە مەبەستی ئەوەبوو خودا لای داناون و ئێستا بردوویەتییەوە..

ئەم مەوقیفە لە پشتیوانیکردن و هەواڵدان بۆ ئارامگرتنی مێردەکەی و وەستان لەگەڵیدا، لەکاتێکدا دەبوو ئەو زیاتر بێئارام بووایە. لەبەرئەوەی دایکی

---

(١) «(أم سليم) قالت : يا أبا طلحة، أرأيت لو أن قوما أعاروا عاريتهم أهل بيت، فطلبوا عاريتهم، ألهم أن يمنعوهم ؟ قال : لا. قالت : فاحتسب ابنك. قال : فغضب، وقال : تركتني حتى تلطخت، ثم أخبرتني بابني ؟ فانطلق حتى أتى رسول الله صلى الله عليه وسلم، فأخبره بما كان، فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم : " بارك الله لكما في غابر ليلتكما ". قال : فحملت،» پێشەوا موسلیم گێڕاویەتییەوە بە ژمارە (٢١٤٤)

منداڵەکەیە، چونکە دایک هەست و سۆزی زیاترە و بەزەیی زیاتری هەیە، بەڵام لەو شوێنەدا ئەو ڕۆڵی ئارامکەرەوەی گێڕا، ئەمەش بە پێوەری دونیایی شتێکی قورس و سەختە، بەڵام بەو پێوەرانەی ئەوان دەکرا و مەفهومێک بوو.

## ڕۆڵی دووەم: خۆڕاگرتنی تاکەکەسی و خود بەرپرسیارییەتی لە گەیشتن بە بڕیاری چارەنووسسازی پەیوەست بە ئایین و دامەزراوەیی لەسەری و سەرخستنی

ڕۆڵی پێشوو پەیوەست بوو بە پشتیوانیکردن، بەڵام ئەم ڕۆڵەیان پەیوەستە بە هەڵگرتنی بەرپرسیارییەتیتاکەوە، ئەگەرچی ئافرەتیش بێت.

نموونەکان:

١ـ دامەزراوەیی «ئوم حەبیب» لە بەرانبەر هەڵگەڕانەوی مێردەکەی عەبدوڵڵای کوڕی جەحش لە ئایین، ئەو کاتەی کە لە حەبەشەدا بوون.

پێشتر لەبەر ئایینی ئیسلام کۆچی کرد بۆ حەبەشە، بەڵام لەوێ هەڵگەڕایەوە و بوو بە مەسیحی، کە دواتریش لەسەر ئایینی مەسیحی مرد. بەڵام ئەم ئافرەتە ملکەچنەبوو بۆ بڕیاری مێردەکەی، ئیسلامی هەڵبژارد بەسەر مێردەکەیدا ئەگەرچی لەیەکیش جیابوونەوە.

ئەمەیە واتای ڕێکخستنی کارە لە پێشینەییەکان و ئەو بابەتە مەزنانەی کە ئەم ئافرەتانەی سەرقاڵ دەکرد.

٢ـ ئەو ئافرەتانەی کە لەدوای ڕێکەوتنی حودەیبییە، کۆچیانکردن بۆ

مەدینە، وەکوو پێشتر باسمان کرد. کە ڕێکەوتن کرا لەنێوان پێغەمبەر (ﷺ) و هاوبەش دانەران، بەوەی هەرکەسێک بە موسڵمانی مەککە جێبهێڵێت و بێت بۆ مەدینە دەبێت بگەڕێنرێتەوە. بەڵام چەند ئافرەتێکی باوەڕدار لە مەککەوە کۆچیان کرد بۆ مەدینە، کە هاتن بەدوایاندا، ئایەت دابەزی کە نابێت بگەڕێنرێنەوە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا جَاءَكُمُ الْمُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ فَامْتَحِنُوهُنَّ ۖ اللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِهِنَّ ۖ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَاتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى الْكُفَّارِ ۖ لَا هُنَّ حِلٌّ لَهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ ۖ﴾ [الممتحنة: ١٠]، واتا: «ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە کاتێک ئافرەتە ئیماندارەکان کۆچ دەکەن و دێن بۆ لاتان تاقیان بکەنەوە و بەوردی پرسیاریان لێ بکەن سەبارەت بە کۆچ و هۆی هاتنەکەیان، خوا ئاگادارە بە باوەڕەکەیان، جا ئەگەر زانیتان باوەڕدارن، ئەوە مەیانگێڕنەوە بۆ لای مێردە بێباوەڕەکانیان، نە ئەم ئافرەتە حەڵاڵی ئەو بێباوەڕانەن، نە ئەو بێباوەڕانەش حەڵاڵن بۆ ئەم ئافرەتە ئیماندارانە ...» بەڵام ئەوەی ئێمە لێرەدا مەبەستمانە ئەوەیە کە چۆن ئەو ئافرەتانە، ئەو بەرپرسیارییەتییەیان هەڵگرت و وازیان لە پیاوەکانیان هێنا و لەپێناو ئایینەکەیان لە مەککەوە کۆچیان کرد بۆ مەدینە.

٣ـ سومەمیە: کاتێک ئەبوو جەهل ئازاری دەدا و سازشی دەکرد لەسەر ئەوەی لە ئایینەکەی هەڵبگەڕێتەوە، بەڵام لەبەرئەوەی ناڕازی بوو، کوشتی! هەروەک دەزانن سومەمیە یەکەم شەهیدی نێو ئیسلامە، بارودۆخەکەشی سەرسوڕهێنەرە. ئەم بەسەرهاتە ئەو پەروەردەیەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ)، لەسەر چ شتێک هاوەڵانی پەروەردە دەکرد.

﴿فَاسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لَا أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِنْكُمْ مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَىٰ ۖ بَعْضُكُمْ مِنْ بَعْضٍ ۖ فَالَّذِينَ هَاجَرُوا وَأُخْرِجُوا مِنْ دِيَارِهِمْ وَأُوذُوا فِي سَبِيلِي

وَقَاتَلُوا وَقُتِلُوا لَأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَلَأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ ثَوَابًا مِنْ عِنْدِ اللَّهِ ۗ وَاللَّهُ عِنْدَهُ حُسْنُ الثَّوَابِ ﴿١٩٥﴾ [آل عمران: ١٩٥]، واتا: «(کاتێک ئیمانداران بەم شێوەیە نزایان کرد، کە پەروەردگاری ئازیزیان فێریان دەکات) بێگومان ئەو زاتە نزاکانیان لێ وەردەگرێت (بە هانا و هاواریانەوە دەچێت بۆیە دەفەرمووێت): بەڕاستی من هەوڵ و کۆشش و کار و کردەوەی هیچ کام لە ئێوە بەزایە نادەم، چ نێرینە و پیاوتان، چ مێیینە و ئافرەتتان (چونکە)هاوکاری یەکتر بوون (لە چاکە و چاکەکاریدا)، جا ئەوانەی کۆچیان کرد و لە شوێنەواری خۆیان دەربەدەرکران و ئازار و ئەشکەنجەدران لەپێناوی مندا و جەنگان و شەهیدکران، بەڕاستی سوێند بێت چاوپۆشی دەکەم لە هەلە و گوناهەکانیان و دەیانخەمە باخەکانی بەهەشتەوە کە چەندەها ڕووبار بەژێر درەختەکانیدا و بەردەم کۆشکەکانیدا دەڕوات، ئەمەش پاداشتێکە لەلایەن خوداوە (پێشکەشیان دەکرێت) خوا پاداشتی چاک و جوانی لایە (بۆ تێکۆشەران).»

کۆتایی ئایەتەکە و سەرەتای ئایەتەکە پێکەوە ببەستەوە، بۆت ڕوون دەبێتەوە ئەو ڕۆڵانە چی بوون کە نێر و مێ پێی هەڵدەستان لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ).

کەواتە لە ڕۆڵی یەکەم و دووەم و ئەو نموونانەی باسمان کرد، ڕوون بوویەوە کە ئافرەتی دامەزراو دەبێت سەرلەنوێ پێناسی خۆی بکاتەوە لەم سەردەمەدا، پێناسی ئەو ڕۆڵانەی کە هەیەتی و دەبێت پێی هەستێت، ئەو بەرپرسیارییەتییانەی کە لەسەرین چین؟ چۆن ئارام بگرێت و بەشدار بێت و خۆڕاگر بێت و پشتیوانیکار بێت؟ هەروەها چەند بواری تر کە دەکرێت ڕۆڵی تێدا ببینێت.

نابێت ئافرەتی موسڵمان ئاسۆی داواکارییەکانی لە مافەکانیدا سنووردار بکات. کە خودی ئەو مافانەشی داوای دەکات، هەندێک جار هەقن و هەندێک جار باتڵ. چونکە ئاسۆی زۆر فراوانتر هەیە و نابێت ئافرەتی موسڵمان بیر و هۆشی لە ئاسۆیەکی تەنگدا سنووردار بکات.

## ڕۆڵی سێیەم: بانگەواز بۆ لای خودا

ئەم ڕۆڵەیان دواتر بۆمان ڕوون دەبێتەوە کاتێک قسە لەسەر ئافرەتانی دوای پێغەمبەر (ﷺ) دەکەین.

بابەتی فەرموودە گێڕانەوە و زانیاری گەیاندنی ئافرەتان، دوای پێغەمبەر (ﷺ) دەستی پێ کرد. بانگەوازکردن بۆ خودا لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) زیاتر بوارەکە بۆ پیاوان فراوانتر بوو، ئەگەرچی ئافرەتانیش ڕۆڵیان هەبوو، بەڵام بواری ئەم بانگەوازە لەدوای پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ئافرەتان زۆر فراوان بوو.

## ڕۆڵی چوارەم: فێربوون و وەدووکەوتنی زانست

ئەم ڕۆڵەیان چەند شێوەیەکی هەبوو:

١ـ پرسیارکردن: کە شێوازێکی بەربڵاو بوو، ئافرەتان پرسیاریان دەربارەی زانینی حوکمێکی شەرع بۆ دروست دەبوو و دواتر پرسیاریان دەکرد بۆ دۆزینەوەی وەڵام و تێگەیشتنی زیاتر. وەڵامی ئەم پرسیارانەش خێزانەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دواتر باسیان لەبارەوە دەکرد بۆ خەڵکی، لەوانەش دایکە عائیشە دەڵێت: «نعم النساء نساء الأنصار، لم يكن يمنعهن الحياء أن يتفقهن في الدين.» [موسلیم:

٣٣٢] واتا: «خودای گەورە ڕەحم بە ئافرەتانی ئەنسارِ بکات کە شەرمکردن ڕێگری ئەوەی لێ نەکردن کە لە ئایین تێبگەن.»

٢- سووربوونیان لەسەر ئەوەی کە ئەوانیش دەبێت وەکوو پیاوان کاتێکی تایبەتیان هەبێت بۆ فێربوونی زانست لەلای پێغەمبەر (ﷺ). ئەوەتا لە بوخاریدا هاتووە، ئافرەتان هاتنە لای پێغەمبەر (ﷺ) و وتیان: «يا رسول الله، ذهب الرجال بحديثك، فاجعل لنا من نفسك يوما نأتيك فيه، تعلمنا مما علمك الله.» [بوخاری: ٧٣١٠] واتا: «ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) کاتی تۆ زیاتر بۆ پیاوانە، با ڕۆژێکیش بۆ ئێمە بێت.» پێغەمبەریش (ﷺ) بەڵێنی ڕۆژێکی پێ دان. دواتر لەو ڕۆژەدا بە خزمەتیان گەشت و زانستی فێرکردن و هەروەها ئامۆژگاری کردن.

٣- تایبەتکردنی ئافرەتان بە زانست، یاخود بە ئامۆژگاریکردن. فەرموودەیەکی مەشهور هەیە لەسەر نوێژی ئافرەت، کاتێک پێغەمبەر (ﷺ) ڕیزی پیاوانی تێپەڕاند و ڕۆشتە ڕیزی ئافرەتان، کە بیلالیشی لەگەڵدا بوو. ئامۆژگاری کردن و یادخستنەوەی کردن و هەروەها هانی دان لەسەر بەخشین، بیلالیش بە جلەکەی بەناو ئافرەتەکان سووڕی دەخوارد و پارەی کۆ دەکردەوە.[1]

٤- ئەو زانستەی کە لە ئەنجامی کۆمەڵێک مەوقیفی ئافرەتان پەیدابوو لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ).

بۆ نموونە: بوخاری چەندین سەرەبابەتی زانستی داناوە لە ئەنجامی بەسەرهاتەکانی ئوم سولەیم لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ)، لەو سەرەبابەتانەش: «سەرەبابەتی شەرم لەزانستدا، ئافرەت خۆی بەتەنیا دەبێت بە ڕیزێک، نوێژی

---

(١) پێشەوا موسلیم گێڕاویەتییەوە بە ژمارە (٨٨٤)

ئافرەتان لەدوای پیاوان، هەرکەسێک سەردانی هۆزێکی کرد و بەربانگی نەکردەوە لەلایان، دیاری بۆ بووک و زاوا، پارانەوە بۆ زیادبوونی سامان لەگەڵ بەرەکەت، هتد...» ئەمانە هەمووی سەرەبابەتن و لە سەحیحی بوخاریشدا هاتوون کە پەیوەستن بە تاکە ئافرەتێکەوە، ئەویش ئوم سولەیمە.

ئەمە جگە لەو گفتوگۆ و مەوقیفانەی کە لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) ڕوویانداوە و لە ئەنجامدا زانایان و شەرعزانان سوودی زانستیان لێ وەرگرتووە

٥ـ سووربوونی ئافرەتان بۆ ئامادەبوون لە کۆڕەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، ئیتر کۆڕی زانست بووبن، یاخود ئامۆژگاری.

یەکێک لەو ڕووداوانەی کە لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە کە ئوم سەلەمەی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێت: «من لە خەڵکیم دەبیست کە باسی حەوزیان ـەبەستی لە حەوزی کەوسەرە دەکرد، بەڵام لە پێغەمبەری خودام (ﷺ) نەبیستبوو.» ئەمەش نیشانەی سووربوونە لەسەر زانست، لە خەڵکی بیستبوو، بەڵام لە پێغەمبەری (ﷺ) نەبیستبوو، بۆیە دەیویست بیبیستێت.. دەڵێت: «ڕۆژێ کە کەنیزەکەکەم قژی شانە دەکردم، گوێم لە پێغەمبەری خودا بوو (ﷺ) دەیفەرموو: ئەی خەڵکینە! منیش بە کەنیزەکەکەم وت: لێم دوور بکەوەرە! ئەویش وتی: پێغەمبەر (ﷺ) بانگی پیاوان دەکات خۆ بانگی ئافرەتانی نەکردووە. منیش وتم: منیش لە خەڵکیم. لەو کاتەدا پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: «إني لكم فرط على الحوض فإياي لايأتين أحدكم فيذب عني كما يذب البعير الضال، فأقول: فيم هذا؟ فيقال: إنك لاتدري ما أحدثوا بعدك، فأقول: سحقاً» [موسلیم: ٢٢٩٥] واتا: «من پێشتان دەکەوم و لەسەر حەوز چاوەڕێتان دەکەم بۆئەوەی ئاوتان پێشکەش بکەم، کەسانێکتان دێن

کە ئاویان پێ بدەم، بەڵام دووردەخرێنەوە هەروەک چۆن وشتری بەرەڵا دوور دەخرێتەوە، منیش دەڵێم بۆچی وایان لێ دەکەن؟ دەڵێن تۆ نازانیت لەدوای تۆ چییان داهێناوە، منیش دەڵێم دووریان خەنەوە.»

٦- گفتوگۆ: ئەم شێوەیان لە چوارچێوەی شێوەی فێربووندایە کە باسمان کرد؛ گفتوگۆی وردەکارییانە و گفتوگۆ لەسەر زیادکردنی چاکە، ئەمەش لەو فەرموودەی پێغەمبەرەوە (ﷺ) ڕوون دەبێتەوە کە دەفەرمووێت: ««ما منكن امرأة تقدم ثلاثة من ولدها، إلا كان لها حجابا من النار». فقالت امرأة: واثنتين؟ فقال: «واثنتين»» [موسلیم: ١٠١] واتا: «هیچ ئافرەتێک لەئێوە نییە کە سێ منداڵی مردبێت مەگەر دەبێتە پارێزەر بۆی لە ئاگر!» ئێمەی ئافرەتیش وتمان: «ئەی پێغەمبەری خودا ئەی ئەگەر دوان بوو؟» ئەویش فەرمووی: «دوانیش.»

هەروەها گفتوگۆ هەیە لەسەر چەند دەقێکی دیاریکراو کە کێشەیان لەگەڵی هەبووە، بۆ نموونە پرسیاری عائیشە ـدەربارەی پرسیارلێکردنی بەندەکان لەلایەن خوداوە لەسەر فەرموودەی: «من حوسب عذب.» قالت عائشة: فقلت: أوليس يقول الله تعالى: ﴿فسوف يحاسب حسابا يسيرا﴾ قالت: فقال: «إنما ذلك العرض، ولكن من نوقش الحساب يهلك» [بوخاری: ١٠٣] واتە: «هەرکەسێک لێپرسینەوەی لەگەڵ کرا سزا دەدرێت. عائیشە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! (ﷺ) ئەی لێپرسینەوەیەکی ئاسان ناکرێت؟ پێغەمبەریش (ﷺ) وەڵامی دایەوە: ئەوەی تۆ دەیڵێی پیشاندانی نامەی کردەوەکانە، بەڵام هەرکەسێک لێپرسینەوەی لەگەڵ کرا تیادەچێت!»

هەربۆیە گفتوگۆکان شێوەیەک بوون لە شێوەکانی فێربوون بەنیسبەت ئافرەتەوە لە سەردەمی پێغەمبەردا.

## ڕۆڵی پێنجەم: جێبەجێکردن و ملکەچی و کارکردن بەو زانستەی فێری دەبوون

ئەم بابەتە لەو بابەتە مەزنانەن کە ئافرەتان پێیەوە سەرقاڵ بوون، بۆیە هەرکاتێک مەوقیفی ئافرەتان لە پشتیوانیکردنی موسڵمان و سەرخستنی ئیسلام باس کرا، ئەوە شێوەیەکە لە شێوەکانی جێبەجێکردنی ئەو زانستەی کە فێری بوون. بەڵکوو تەنانەت لە شێوە باڵاکانی جێبەجێکردنە، جێبەجێکردنێکە کە سەختی و ناڕەحەتیشی تێدایە.

نموونەکان:

١ـ دایکی باوەڕداران عائیشە دەڵێت: «ڕەحمەتی خودا لە ئافرەتانی ئەنسار بێت کە خودا ئەم ئایەتەی دابەزاند[1]: ﴿وَقُلْ لِلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ أَوْ نِسَائِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُولِي الْإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ أَوِ الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَىٰ عَوْرَاتِ النِّسَاءِ ۖ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِنْ زِينَتِهِنَّ ۚ وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣١﴾﴾ [النور: ٣١]، واتا: «بە ئافرەتانی ئیمانداریش بڵێ: چاویان بپارێزن (لە سەیرکردنی نامەحرەم) داوێنی خۆیان بپارێزن لە گوناهـ و جوانی خۆیان دەرنەخەن جگە لەوەی کە دیارە (وەک دەموچاو و دەست) با سەرپۆشەکانیان بدەن بەسەر سینە و ملیاندا

---

(١) پێشەوا بوخاری گێڕاویەتییەوە بە ژمارە (٤٧٥٨)

و جوانی و زینەتی خۆیان دەرنەخەن بە تەواوی بۆ هاوسەرەکانیان نەبێت، یان باوکی خۆیان، یان باوکی مێردەکانیان، یان کوڕی خۆیان، یان کوڕی مێردەکانیان، یان بۆ براکانی خۆیان، یان برازاکانیان، یان خوشکەزاکانیان، یان ئافرەتێک کە پەیوەندییان هەیە پێکەوە، یان ئەوانەش کە کەنیزەکانیانن (کە لە بارودۆخی تایبەتدا هەبوون) یان ئەوانەی کە لە ماڵەکانتاندا دەژین و پێویستیان بە ئافرەت نییە (لە بەر پیری، یان نەخۆشی...هتد) یاخود ئەو منداڵانەی کە هێشتا شارەزاییان لە ئافرەتان نییە و (ئارەزووی جنسیان بۆ دروست نەبووە و نازانن باسی عەورات بکەن) نابێت ئافرەتانی ئیماندار قاچیان دەربخەن و پێیان بدەن بە زەویدا (تا دەنگی خشڵ و پاوانەکانیان بێت) و بزانرێت کە زینەتدار و خشڵدارن، کەواتە هەمووتان ئەی باوەڕداران بەرەو لای خودا و بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەو بگەڕێنەوە بۆئەوەی ڕزگار و سەرفراز بن.» ئیدی ئافرەتان پارچەیان لە عاباکەیان کردەوە و ڕووخساری خۆیانیان پێ داپۆشی. ئەمەش لەبەر زوو بەدەمەوە چوونیان بۆ جێبەجێکردن و وەڵامدانەوەی فەرمانی خودا. ئەوان چۆنییەتی ژیانی خۆیان لێکنەدایەوە، بە بیانووی ئەوەی کە ناتوانن پێی هەستن، بەڵکوو فەرمانی خودایان ڕاستەوخۆ جێبەجێ کرد.

## ڕۆڵی شەشەم: داواکردنی مافەکانیان

دووبارە دەیڵێمەوە: بابەتی داواکردنی مافەکانیان، نابێت وەکوو داواکردنی مافەکانی ئەمڕۆ سەیر بکرێت. بۆ نموونە داوای مافی ئازادی ڕەها لە هەموو شتێکدا ئەگەرچی کوفریش بێت، لادانی جەستەیی و ... تاد. نەخێر، کاتێک باسی ماف دەکەین مەبەست پێی ئەمە نییە، هاوتای وشەکان نابێتە

هۆی هاوتای جێبەجێکردنی لە واقعدا. هەروەها مەبەست لێی ئەوە نییە پێشتر ئافرەتەکان ستەملێکراو بوون و بەو داوایەیان دەیانویست مافی خۆیان وەربگرنەوە. نەخێر، ئەسڵەن لە بنچینەدا داواکردنی مافەکانیان وێنەدانەوە بوو بۆ ئەو بابەتە مەزنانەی کە پێیەوە سەرقاڵ بوون، کە گرنگترینی ئەو بابەتانەش: کردەوە و وەڵامدانەوە و سەرخستنی ئیسلام و موسڵمانان بوو.

نموونەکان:

١- ئەوان داوایان لە پێغەمبەر (ﷺ) دەکرد: «ئەی پێغەمبەری خودا! (ﷺ) دەمانەوێت جیهاد بکەین، چونکە دەبینین جیهاد باشترین کردەوەیە.» ئەمە داواکردنی مافی ئەوان بوو، کە جیاوازییەکی زۆر هەیە لەنێوان ئەوان و ئەوەی ئەمڕۆ لە واقعدا بوونی هەیە.

ئەمە ئەو نموونەیە کە دەمەوێت زۆر لەسەری بوەستم. لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە کە ئەبوو موسای ئەشعەری دەیگێڕێتەوە: «عن أبي موسى رضي الله عنه قال: بلغنا مخرج النبي ﷺ ونحن باليمن، فخرجنا مهاجرين إليه أنا، وأخوان لي أنا أصغرهم؛ أحدهما أبو بردة، والآخر أبو رهم، إما قال: بضع، وإما قال: في ثلاثة وخمسين، أو اثنين وخمسين رجلا من قومي، فركبنا سفينة، فألقتنا سفينتنا إلى النجاشي بالحبشة، فوافقنا جعفر بن أبي طالب، فأقمنا معه حتى قدمنا جميعا، فوافقنا النبي ﷺ حين افتتح خيبر وكان أناس من الناس يقولون لنا يعني لأهل السفينة: سبقناكم بالهجرة.

ودخلت أسماء بنت عميس -وهي ممن قدم معنا- على حفصة زوج النبي ﷺ زائرة وقد كانت هاجرت إلى النجاشي فيمن هاجر، فدخل عمر على حفصة،

وأسماء عندها، فقال عمر حين رأى أسماء: من هذه؟ قالت: أسماء بنت عميس. قال عمر: الحبشية هذه؟ البحرية هذه؟ قالت أسماء: نعم. قال: سبقناكم بالهجرة، فنحن أحق برسول الله ﷺ منكم. فغضبت، وقالت: كلا والله، كنتم مع رسول الله صلى الله عليه وسلم يطعم جائعكم، ويعظ جاهلكم، وكنا في دار - أو في أرض - البعداء البغضاء بالحبشة وذلك في الله وفي رسوله ﷺ، وايم الله لا أطعم طعاما، ولا أشرب شرابا حتى أذكر ما قلت لرسول الله ﷺ ونحن كنا نؤذى ونخاف، وسأذكر ذلك للنبي ﷺ، وأسأله والله لا أكذب، ولا أزيغ، ولا أزيد عليه.

فلما جاء النبي ﷺ قالت: يا نبي الله، إن عمر قال: كذا وكذا. قال: «فما قلت له؟» قالت: قلت له: كذا وكذا. قال: «ليس بأحق بي منكم، وله ولأصحابه هجرة واحدة، ولكم أنتم أهل السفينة هجرتان.» قالت: فلقد رأيت أبا موسى، وأصحاب السفينة يأتوني أرسالا يسألوني عن هذا الحديث ما من الدنيا شيء هم به أفرح، ولا أعظم في أنفسهم مما قال لهم النبي ﷺ. قال أبو بردة: قالت أسماء: فلقد رأيت أبا موسى وإنه ليستعيد هذا الحديث مني.» [بوخاری: ٤٢٣٠,٤٢٣١] واتا: «دەرچوونگەی پێغەمبەرمان (ﷺ) پێگەشت کاتێک لە یەمەن بووین و دواتر کۆچمان کرد بۆ لای. کە من و دوو برام بووین و من بچووکەکەیان بووم، یەکێکیان ئەبوو بەردە بوو، ئەوی تر ئەبوو ڕوهم هەروەها یان وتی هەندێک یاخود وتی ٣٥ یان ٢٥ کەس لە هۆزەکەمیشمان لەگەڵدا بوو، سواری کەشتی بووین و بە کەشتییەکە ڕۆیشتین بۆ لای نەجاشی لە حەبەشە. لەوێ بە جەعفەری کوڕی ئەبوو تالیب گەشتین، لای ئەو ماینەوە تاوەکوو پێکەوە گەشتمان کرد. دواتر گەشتین بە پێغەمبەری خودا (ﷺ) لەوکاتەی کە فەتحی خەیبەری کردبوو. هەندێک لە خەڵکی بە

ئێمەیان دەوت، واتا ئەهلی کەشتییەکە: ئەی ئەهلی کەشتییەکە، ئێمە پێش ئێوە کەوتووین بە کۆچکردن. ئەسمای کچی عومەیس ڕۆشت بۆ سەردانی حەفسەی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) وەکوو میوانی. ئەسما لەوانەبوو کە کۆچی کردبوو بۆ لای نەجاشی.

لەوکاتەدا عومەر هاتە ژوورەوە بۆ لای حەفسە، ئەسماش لەلای بوو. کاتێک عومەر ئەسمای بینی، وتی ئەمە کێیە؟ حەفسەش وتی: ئەسمای کچی عومەیسە، عومەریش وتی: ئەمە حەبەشی و بەحرییەکەیە (مەبەستی ئەوەبوو لە حەبەشەدا بووە و دواتر بەدەریادا کۆچیانکردووە بۆ ئێرە)؟ ئەسماش وتی بەڵێ، عومەر وتی: ئێمە بە کۆچکردن پێش ئێوە کەوتووین بۆیە ئێمە لەئێوە شایستەترین بە ڕەسولی خودا (ﷺ)، ئەسماش تووڕەبوو و وتی: نەخێر وەڵاهی، ئێوە لەگەڵ ڕەسولی خودا (ﷺ) بوون، برسیتانی تێردەکرد، ئامۆژگاری نەزانتانی دەکرد، ئێمەش لە زەوییەکدابووین دوور و بوغزێنراو لە حەبەشە، لەبەر خودا و ڕەسولی خودا (ﷺ). شەرتبێت خواردن و خواردنەوە نەخۆم تاوەکوو ئەوەی وتت بە ڕەسوولی خودا (ﷺ)ڕادەگەیەنم. هەروەها ئێمە ئازارمان دەچەشت و دەترساین، ئەوەش بە ڕەسولی خودا (ﷺ) دەڵێم و پرسیاری لێ دەکەم، وەڵاهی من درۆناکەم و لانادەم و هیچیشی بۆزیاد ناکەم.

کاتێک کە پێغەمبەر (ﷺ) هات، ئەسما وتی: عومەر وا و وای وت، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: تۆ چیت پێ وت، ئەسماش وتی: ئەوە و ئەوەم پێ وت، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ئەو(عومەر) لە ئێوە(ئەهلی کەشتییەکە) بەمن شایستەتر نییە، ئەو و هاوەڵانی یەک کۆچیان هەیە (کە لە مەککەوە کۆچیان کردووە بۆ مەدینە)، بەڵام ئێوە -ئەهلی کەشتی- دوو کۆچتان هەیە (سەرەتا لە مەککە کۆچیان کردووە بۆ حەبەشە و یەمەن،

دواتریش لەوێوە بۆ مەدینە).

ئەسما وتی: دواتر بینیم ئەبو مووسا و هاوەڵانی کەشتییەکە هەموویان دەهاتن بۆلام و پرسیاری ئەم فەرموودەیان لێ دەکردم، هیچ شتێک لە دونیا هێندەی ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) دەرهەقیان فەرمووی، لایان خۆشتر و گەورەتر نەبوو.)

ئەمە شتێکی سەرسوڕهێنەرە!، بەتەنیا لەڕێی ئەم چیرۆکەوە دەتوانیت بڕوانیتە سەر ئەوەی لە کۆمەڵگەی پێغەمبەریدا (ﷺ) هەبووە، بۆئەوەی شتێکی لەبارەوە بزانیت. تەنانەت لە بابەتی هاوسەنگی ڕاگرتن لەنێوان داخران و بەستنەوەی ئافرەت لەگەڵ پارێزگاری لێکردنی؛ ببینە ئەوان یەک لەدوای یەک دەهاتن بۆ بیستنی ئەم فەرموودەیە، بۆلای کێش؟ بۆلای ئافرەتێک. کە ڕەنگە ئێستا لە هەندێک شوێندا ڕێگری بکرێت لەم بابەتە، چۆن لە ڕێی ئافرەتەوە گوێبیستی فەرموودە دەبین!

هەروەها لە داواکاری و سووربوونەکانیان بڕوانن و سەرنج بدەن چ شتێک جوڵێنەر و پاڵنەریانە. خۆ مافی دونیایی نەبوو، لەکاتێکدا ئەو هەموو خەم و تووڕەیی و سەرقاڵی و هەروەها خواردن و خواردنەوەی باشیان نەدەخوارد چوون کۆچیانکردبوو. بەڵام سەرەڕای ئەوانەش، ئەوەی بۆی گرنگ بێت ئەم قسەیە: ئێمە لە ئێوە زیاتر شایستەترین بە پێغەمبەری خودا (ﷺ)؟ بابەتەکە ئەوەیە کێ شایستەترە بە پێغەمبەر (ﷺ) نەک شتی دیکە!

## ڕۆڵی حەوتەم: ڕۆڵە کۆمەڵایەتییەکان

ئەمە ناونیشانێکی گەورەیە، ناتوانم هەروا بەسەریدا بڕۆم و جێی بهێڵم، بەڵام بێگومان ئافرەت لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە و لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) بە ڕۆڵی جیاواز ئامادەیی هەبوو. بەتەنیا مەبەستم پێی بابەتی ژن و مێردایەتی نییە، بەڵکوو لە ڕووی کۆمەڵایەتییشەوە، تەنانەت ئەو باسەی کە هێنامانەوە کەئافرەتان لەکاتی جەنگدا: (نەخۆشەکانمان تیمار دەکرد و برینەکانمان سارێژ دەکرد و خزمەتی نەخۆشەکانمان دەکرد) ئەمەش شتێکە دەکرێت بچێتە چوارچێوەی رۆڵی کۆمەڵایەتییەوە، ئەگەرچی لە بنچینەدا کارێکە بۆ ئیسلام، بەڵام لێرەدا دەمەوێت بچمە نێو هەندێک بابەتی پەیوەست بە ژن و مێردایەتییەوە.

نموونەکان:

لە ڕوویەکەوە پەیوەندی هەیە بە لایەنی خێزانییەوە و لە ڕوویەکی دیکەوە پەیوەندی بە لایەنی کۆمەڵایەتییەوە هەیە، ئەویش فەرموودەیەکە کە لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە،[1] عائیشە باسی ئەوە دەکات کە کۆمەڵێک لە ڕەشپێستەکان یارییان بە حیراب دەکرد (جۆرێکە لە یاری تایبەت بە گەلێک،) عائیشە وتی: «یان لە پێغەمبەرم (ﷺ) پرسی یان خۆی پێی وتم: ئایا ئارەزوو دەکەی کە سەیریان بکەیت؟،» عائیشە هاتە پێشەوە کە لەپشتی پێغەمبەرەوە (ﷺ) بوو و ئامادەی ئەم چالاکییە کۆمەڵایەتییە بوو، ئەگەرچی بەدڵنیاییەوە ئەم بابەتە لە مەزهەلەکانی ئەمڕۆ زیاتر نییە، بەڵام مەبەستەکە ئەوەیە ڕووداوێکی کۆمەڵایەتی لە مەدینە ڕوویداوە و پێغەمبەریش (ﷺ) دەزانێت کە عائیشە ویستی ئەوەی هەیە سەیری بکات، بۆیە ڕێگەی دا کە بەشداری بکات لە

---

(١) پێشەوا بوخاری گێڕاویەتییەوە بە ژمارە (٢٩٠٧)

سەیرکردنی ڕووداوەکە، تەنانەت پێغەمبەر (ﷺ) لێی پرسی: ئایا تەواو لێی تێربوویت؟ یان قسەیەکی لەو شێوەیە، دواتر لێبوویەوە و ڕۆشتن.

## ڕۆڵی هەشتەم: پیشەی ئافرەت

ئایا هیچ بوارێک هەبوو ئافرەت وەکوو پیشە کاری تێدا بکات؟

لەگەڵ دووبارە ئاگادارکردنەوە: پیشەی ئافرەت مەبەست پێی ئەوە نییە کە پێویستە وەکوو پیشەی ئەمڕۆی ئافرەت بێت، نەخێر پێویستە کە هەندێک شتی تێدا ڕەچاوبکرێت.

بەڵام هەندێک لایەن هەن کە لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) هەبوون ئەوە دەردەخەن کە پیشەگەلێک هەبوون ئافرەت دەکرا کاری تێدا بکات.

نموونەکان:

لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە، جابر دەڵێت: «طلقت خالتي، فأرادت أن تجد نخلها، فزجرها رجل أن تخرج، فأتت النبي ﷺ، فقال: «بلى، فجدي نخلك، فإنك عسى أن تصدقي، أو تفعلي معروفا.»» [موسليم ١٤٨٥] «پوورم تەڵاق درا، بۆیە ویستی ئەوەی هەبوو کە ئەو خورمایانە لێبکاتەوە کە لە دارخورماکاندا هەبوون، بەڵام پیاوێک ڕێگری لێکرد کە بڕواتە دەرەوە،» ڕێگری کردنەکەی لە ڕووی ئەوەوە نەبوو کە نەهێڵێت ئافرەت بڕواتە دەرەوە، بەڵکوو ئەو تەڵاق درابوو لەبەر ماوەی عیددەکەی ڕێگری لێ کرد، «پێغەمبەری خودا (ﷺ) هات و فەرمووی: بەڵێ بڕۆ خورمای دارخورماکانت لێبکەوە، بەڵکوو لێیان ببەخشیت، یاخود کاری چاکەی پێ بکەیت.» بێگومان شەرعزانان کۆمەڵێک ڕێ و

شوێنی فیقهیان داناوه بۆ دەرچوونی ئافرەت لەکاتی عیددەدا، هەندێک دەڵێن مەرجە بە ڕۆژدا یاخود لەبەر پێویستییەک بڕوات و هتد، بەڵام ئەم فەرموودەیە نموونەیە لەسەر ئەوەی ئەو ئافرەتە دارخورمای هەبوو و لە کارەکانیشی ئەوەبوو کە خورمای لێ دەکردەوە.

نموونەیەکی شیرین و جوانە لەسەر زەینەبی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ)[1]، بەم شێوەیە بوو؛ خێزانەکانی پرسیاریان لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد: ئەی ڕەسولی خودا (ﷺ) کام لە ئێمە بە مردن زووتر پێت دەگەین؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ئەوەتان کەدەستی درێژە خێزانەکانی دارێکیان هێنا و دەیان پێوا ئاخۆ کامیان دەستی درێژترە، پێغەمبەریش (ﷺ) لەقسەکەیدا مەبەستی ئەوەیان بوو کە زیاتر دەبەخشێت. وتی: زەینەب دەست درێژترینی ناومان بوو، بە دەستەکانی کاری دەکرد و دەیبەخشی، لە هەندێک ڕیوایەتدا هاتووە کە کاری پێست خۆشکردن و ئەو شتانەی دەکرد.

کەواتە هیچ ڕێگرییەک نەبوو لەوەی ئافرەت پیشەی خۆی هەبێت، بەڵام بێگومان واقعی ئەوکات وەکوو واقعی ئەمڕۆ نەبووە، واقعی ئەمڕۆ ئاڵۆزە، قسەکردن لەسەری پێویستی بە زۆر خەملاندن هەیە. خەملاندن نە لە ڕووی توندی و نە لە ڕووی شلکردنەوە بەتەنیا، بەڵکوو خەملاندنی جۆراوجۆری پێویستە، بەڵام ئێستا ئێمە ئامانجمان تەنیا باسکردنی حاڵی ئافرەتە لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ).

لێرەدا دەمەوێت چێوەیەک یاخود سنوورێک باس بکەم کە پەیوەندی بە ملکەچی و جێبەجێکردنەوە هەیە، دەکرێت بەتەنیا یاخود وەکوو ئامۆژگارییەک

---

(١) پێشەوا بوخاری گێڕاویەتییەوە بە ژمارە (١٤٢٠)

باسبکرێت: ئافرەت لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) لە هەموو ئەم بوارانەدا کە کاری تێدا دەکرد، چ وەڵامدانەوەی بێت بۆ شەریعەت یاخود جێبەجێکردن و کارکردن، لە هەموویاندا پارێزگاری لە مەبەستەکانی شەریعەت و ئیسلام دەکرد. بەتایبەت لەو شوێنانەی کە پیاوی لێبوو؛ هەروەها لە کۆمەڵگەی پێغەمبەریدا (ﷺ) بابەتەکە بەو جۆرە نەبووە کە پیاو و ئافرەت نابێت بەرکەوتنیان هەبێت، بەڵکوو لە چەندین مەوقیف بەرکەوتن هەبووە هەر وەکوو باسمان کرد، لەنێویاندا لە بواری زانست و فێرکردن کە پیاوان دەهاتن گوێبیستی ئەو فەرموودانەی پێغەمبەر (ﷺ)دەبوون، کە لەلای ئافرەتان بوو.

بەڵام ئەم بەرکەوتنانە ڕێگری ئەوەی نەدەکرد کە کۆمەڵێک ڕێسا و ڕێ و شوێنی تایبەت هەبن و هەروەها سەرەڕای ئەوەش ئافرەتەکان خۆیان ڕەچاوی حاڵەت و ڕێساکانیان دەکرد. خودی پێغەمبەر (ﷺ) خۆی هەڵدەستا بە بونیادنانیان لەسەر ئەم پەروەردەیە، بۆئەوەی حاڵەتێک دروستنەبێت کە پیاوان وەها مامەڵە لەگەڵ ئافرەتاندا بکەن، وەکوو ئەوەی هاوڕێیان بن، یاخود وەها مامەڵە بکەن کە ئافرەتن و جیاوازییەکان هەڵبوەشێننەوە، نەخێر؛ پانتاییەک هەبوو بۆ بەرکەوتن و مامەڵەکردن و کارلێکردن، بەڵام لە هەمان کاتدا ڕێسایەک هەبوو؛ بۆ نموونە لە لایەنی خواپەرستی و بەرکەوتنیان لەکاتی ئامادەبوون لە نوێژدا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: «**«خير صفوف الرجال أولها، وشرها آخرها. وخير صفوف النساء آخرها، وشرها أولها.»**» [موسليم: ٤٤٠] «چاکترین ڕیزی پیاوان سەرەتاکەیەتی و خراپترینیش کۆتایەکەیەتی، چاکترین ڕیزی ئافرەتان کۆتاییەکەیەتی و خراپترینیش سەرەتاکەیەتی.» ئەمە ڕەچاوکردن و ڕێسای تێدایە. هەروەها لە مزگەوتدا ئافرەتان لە دوای نوێژ، دەبێت زوو هەستن مزگەوت جێبهێڵن. یاخود وەکوو بابەتی دەنگ ناسک نەکردنەوە و هتد.

بەڵێ ئەمە هاوسەنگی ڕاگرتنە، لەنێوان ئەو پانتاییەی کە هەبوو بۆ بەرکەوتن لەگەڵ ڕێساکاندا.

حاڵی کۆمەڵگەی پێغەمبەر (ﷺ)، حاڵەتێک نەبوو کە دابڕانی تەواوەتی هەبێت؛ وەکوو ئەوەی لە ڕێگەدا تابلۆیەکی سوور هەڵواسرابێت و نووسرابێت: «لێرەوە بۆ پیاوان»، «لێرەوە بۆ ئافرەتان»، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا حاڵەتێکی بەسانایی گرتن نەبوو کە هیچ ڕێسایەکی تێدا نەبێت، بۆنموونە لە نوێژی جەژندا پیاوان لە بەرانبەر پێغەمبەردا (ﷺ) بوون و ئافرەتانیش لەدواوە، هیچ ڕێگرییەک و بەربەستێک لەنێوانیاندا نەبوو، بەڵام لەدواوە جۆرێک لە جیاکردنەوە و بۆشایی خستنە نێوانیان هەبوو.

حاڵی کۆمەڵگەی پێغەمبەر (ﷺ)، حاڵەتێکی دانایی بوو، پێویستە باوەڕدار بژاردەی لایەنەکانی ئەو کۆمەڵگەیە بکات و بەتەنیا لایەنێک و هەندێک نموونە بۆی بەس نەبێت. چوون هەریەک لە دوو لایەنی ناکۆکی ئەمڕۆ توندڕەو و شلگرتوو، تەنیا هەندێک مەوقیف بە بەڵگە دەهێننەوە؛ بۆیە لایەنێکیان دەکرێت ئەو پانتایی و فراوانییە لەبیر بکات کە هەبوو. تەنانەت ئینکاری ئەوە بکات کە ئافرەت بە بانگەوازەوە سەرقاڵ ببێت! وەکوو غیرەتێکی ئیسلامی و موسڵمانیانە ئافرەت هیچ شوێن و بوارێکی بۆ نییە کاری تێدا بکات مەگەر لەناو ماڵەکەی خۆیدا نەبێت، کە پەروەردە بکات. ئەمە تێڕوانینی لایەنێکیان کە هەموو ئەمانەی باسمان کرد فڕێ دەدرێنە ناو دەریاوە ... بۆ خاتری خودا ئەم تێڕوانینە چەوتە چییە؟!

تێڕوانینی لایەنەکەی دیکە: «بڕوانن ئافرەت لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) پیشەی هەبووە، ئێ باشە لەسەر بنەمای ئەوە باائافرەت پیشەی خۆی هەبێت،

بەڵام وەکوو دەزانیت ئێستا لە فڵانە شوێن، شێوازێکی دیاریکراوی کارکردن هەیە، کە ئەمەش ئاساییە چوون پێغەمبەر (ﷺ)دەفەرمووێت: «يسروا ولا تعسروا، وبشروا ولا تنفروا.» [بوخاری: ٦٩] واتا: «ئاسانکار بن و قورسکار مەبن، موژدە بدەن و خەڵکی ڕاو مەنێن. ئیسلام ئایینی ئاسانکارییە ...»

باشە کاکی خۆم ئەم کارەی باسی دەکەیت، مەرجی ئەوەی داناوە کە ئافرەت دەبێت واز لە حیجابەکەی بهێنێت! یاخود لە فەرمانگەیەکدا بەتەنیا لەگەڵ پیاوێکدا بێت و بە درێژایی ڕۆژەکە پێکەوە دابنیشن.

لەبەرانبەر ئەمەدا دەڵێن: «براکەم گومانی خراپ بە خەڵکی مەبە، ئایا تۆ خۆت نازانیت کە کچی چاکە و متمانەت پێی هەیە ...» ئەزیزم بابەتەکە بەم شێوەیە نییە، چوون ڕەسول (ﷺ) دەفەرمووێت: «لا يخلون رجل بامرأة إلا كان ثالثهما الشيطان.» [سەحیح سونەن تورمزی: ١١٧١] «هیچ پیاو و ئافرەتێک بەتەنیا پێکەوە نابن مەگەر سێ‌هەمیان شەیتانە.» بیرۆکەکە ئەوەیە پێغەمبەر (ﷺ) مەبەستی بووە کە کۆمەڵێک ڕێسا دابنێت. چوون ئەم ڕێسایانە بۆ مەبەستێک بنیات دەنران.

بۆیە کاتێک پێغەمبەر لە نوێژدا دەیفەرموو: چاکترین ڕیز فڵانە ڕیزە، ڕیزی ئافرەتانی لەدوای پیاوان دادەنا، ئەمە بنیاتێکە مەبەستی ڕێسا بوو لە دەروونەکاندا، بۆئەوەی هەمیشە ئاگاداری بین و لەیادی نەکەین کە بڵێین مادام لەناو خواپەرستیداین، گرنگی نادەین بەشتی تر.

# ئافرەتانی دوای پێغەمبەر (ﷺ) لە ڕووی فێرکردن و خزمەتکردنی ئیسلامەوە

زۆر بابەتی گرنگ هەن کە لەڕێی بوونی زانیاری دەربارەی ئافرەتانی دوای پێغەمبەرەوە (ﷺ) (کە لەمردنییەوە دەست پێ دەکات) بۆمان دەردەکەون.

بێگومان ئێمە قسەمان لەسەر ئافرەتانی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) کرد و کۆمەڵێک گەواهی و نموونەمان هێنایەوە؛ بەڵام بەردەوامی مەوقیفی ئافرەتان، بەتایبەت لەدوای پێغەمبەرەوە (ﷺ)، بابەتەکە بە شێوەیەکی زیاتر ڕووندەکاتەوە؛ بەجۆرێک کە ئاخۆ خەمی ئافرەت لەو سەردەمەدا چی بوو؟ مەودای بیرکردنەوەی چەند بوو، ئەو بابەتە گەورانە چی بوون کە سەرقاڵی کردبوون؟

ئەم باسانە لە شەش بەشدا تاوتوێ دەکەین بە ویستی خودا:

## بەشی یەکەم: پێشەکییە زانستییەکان

زۆربەی ئەو کێشانەی کە دەکرێت بخرێنەڕوو یاخود خراونەتەڕوو؛ وەڵامەکەی لە ڕێگەی ئەم پێشەکییە زانستییانەوە بۆ دەردەکەوێت.

١- هەروەکوو چۆن جێبەجێکردنەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ڕوونکەرەوەی ئەو بابەتانەیە کە بە شێوەی ڕەها و گشتی لە قورئاندا هاتوون، بە هەمان شێوە

جێبەجێکردنی هاوەڵانیش پشتیوان و یارمەتیدەرە بۆ تێگەیشتن لە ڕێنموونییەکانی پێغەمبەر (ﷺ) و سنوورەکانی و پەراوێز و بابەتە جێگیرەکانی.

پێشتر لە پێشەکییەکانی سەرەتادا پێیدا تێپەڕین کە کۆمەڵێک ئایەت و فەرموودەی پەیوەست بە بابەتی ئافرەت هەن، ڕوونکردنەوە و تێگەیشتنیان بە شێوەیەکی ورد، بەهۆی جێبەجێکردن و کارەکانی پێغەمبەرەوەیە (ﷺ). ئەمەش تایبەت نییە بە لایەنی ئافرەتەوە، بەڵکوو بە شێوەیەکی گشتی هەموو لایەنێک دەگرێتەوە.

بۆنموومە ئەم وتەیەی خودا: ﴿وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ﴾ تێگەشتن لێی ئەستەمە مەگەر بە ڕوانینێکی گشتی نەبێت بۆ ئەو مامەڵەکردنەی کە لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) هەبوو لەگەڵ ئەم ئایەتەدا.

٢- کاتێک لە چۆنییەتی ژیانکردنی ئافرەتانی دوای پێغەمبەر (ﷺ) ڕادەمێنین، دەبینین درێژکراوەی سێ بابەتە مەزنەکەیە کە باسمان کرد. واتا بە ڕوانین بۆ مەوقیفی ئافرەتانی دوای پێغەمبەر (ﷺ) دڵنیا دەبین دەربارەی ئەوەی کە خەم و چەقی بایەخدانیان لەو سێ بابەتە مەزنەدا چڕکردبوویەوە، ئەوانیش:

- بایەخدان بە زانست

- بایەخدان بە جێبەجێکردن و ملکەچی

- بایەخدان بە شاندانە ژێر بابەتی سەرەکی کە ئەویش بابەتی سەرخستنی ئیسلام و خزمەتکردنییەتی

٣- هەروەک چۆن ژیانی ئافرەتانی دوای پێغەمبەر (ﷺ)، جەختکردنەوەی

بابەتی هاوبەشی -پیاو و ئافرەت- تێدایە لە خزمەتکردنی ئیسلام؛ بە هەمان شێوەیە ڕاستکردنەوەی تێدایە بۆ ئەو بوارانەی کە باش نییە ئافرەت بەشداری تێدا بکات، لەژێر ناوی سەرخستنی ئیسلام و خزمەتکردنی کاروبارەکانی. واتا حاڵەتی ئافرەتانی دوای پێغەمبەر (ﷺ)، حاڵەتێکی هاوسەنگی و تێگەشتنی تێدایە.

بۆنموونە لە ژیانی ئەو ئافرەتاندا نایبینین کە: سەرۆکایەتی گشتییان گرتبێتە دەست، یاخود بوونە پێشەوا لە مزگەوتدا و ... هتد.

بەڵێ بابەتێکی مەرکەزی لە ژیانیاندا هەیە، کە ئەویش خزمەتی ئیسلام و موسڵمانانە، بەڵام کردارەکانیان ئەوە ڕوون دەکەنەوە کە لە چوارچێوەی هەمان ناونیشان هەندێک بوار و ڕۆڵ هەبوونە ئافرەتان دەستیان نەداوەتێ، چوون ئیشی ئافرەت نەبووە. جگە لەوانەش بەڵگەی شەرعی هەن، کە پشتگیری ئەم واتایە دەکەن. بەڵام من لێرەدا مەبەستم ئەوەیە لە ڕێی جێبەجێکردن و کارەکانیانەوە، لە هەردوولایەن بەهرەمەند دەبین.

هەربۆیە ئیبن قودامە دەڵێت: «هەربەم چەشنە نە پێغەمبەر (ﷺ)و نە یەک کەسیش لە هاوەڵان و ئەوانەی دوای وانیش، دەسەڵاتی دادوەری یاخود فەرمانڕەوایەتی وڵاتێکیان بە ئافرەت نەداوە. لەوانەی کە پێمان گەیشتوون، ئەگەر ڕێگە پێدراو بووایە، ئەوا بە شێوەیەکی گشتی سەردەمەکان لەو نموونانە بێبەش نەدەبوون.»

هەروەها «وەلیدی باجی» باسی دادوەریکردنی ئافرەت دەکات و دەڵێت: «دەربارەی دادوەری، کاری موسڵمانان لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) بەسە بۆ گەواهی، نازانین کە ئافرەتێک لە سەردەمێک لەسەردەمەکان یاخود وڵاتێک

لە وڵاتەکان پێشخرابێت، هەروەکوو چۆن بۆ پێشەوایەتیش پێش نەخراوە.»

هەربۆیە ژیانی ئافرەتانی دوای پێغەمبەر (ﷺ) و ئەو ئافرەتە باوەڕدارانەی هاوچەشنیان بوون، ڕێنموونین بۆ ئێمە. هەروەها ژیانیان، چەترە گشتییەکانی خزمەتکردنی ئیسلام و موسڵمان و خزمەتکردنی زانستمان بۆ ڕێکدەخات؛ بەڵێ ئەمە خەم و بابەتێکی مەرکەزی بوو لە ژیانیان، بەڵام دواتر هەندێک ڕۆڵ و بوار هەبوون، کەبۆ ئافرەت نەبوو بەشداری تێدا بکات.

٤- ئەو کاریگەرییەی کە ئافرەتانی دوای پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر چینە بەرزەکانی تابیعین هەیانبوو، کاریگەرییەکی دیارە؛ بەڵام دواتر ئەو کاریگەرییەی ئافرەت، لە سەردەمی تابیعین و تابعی تابعین و دواتری، وردە وردە کەم دەکات.

ئەو نموونە ئافرەتەی کە پێغەمبەر (ﷺ) دروستی کرد لەسەر بابەتە مەزنەکان، وێنەدانەوەی ڕوونی هەبوو لەسەر چینی یەکەمی تابیعین، بەڵام دوای ئەوە کەمبوونەوەیەکی ترسناک ڕوویدا لەو کاریگەری و پێگەیەی ئافرەت هەیبوو. بە جۆرێک وەها خەیاڵ دەکرێت کە ئافرەت هیچ ڕۆڵێکیان نەبوویێت لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ)؛ نەخێر هەرگیز، بەڵکوو بابەتەکە هەڵگەڕانەوە و دوورکەوتنەوە بوو لە هەیکەلی بابەتە مەزنەکان. هەربۆیە ئێمە دەمانەوێت ئافرەتانێکی شەرعزان و فەرموودەناس و زانا و مامۆستای هاوشێوەی سەردەمی پێغەمبەر و دوای پێغەمبەر (ﷺ)بگێڕینەوە؛ ئافرەتێک کە خزمەتی کاروبارەکانی ئیسلام و موسڵمانان بکات، هەروەکوو چۆن ئەو ئافرەتانە ئەنجامیان دەدا.

٥-ئەم پێشەکییەیان تەواوکارییە بۆ ئەوانەی کە باسمان کرد، کۆمەڵێک

نموونە لە مێژووی ئیسلامی دەخەمە ڕوو لەسەر ئەو ئافرەتانەی کە بە جێبەجێکردنی سێ بابەتە مەزنەکە هەڵدەستان.

## بەشی دووەم: زانست و فێربوون لەلای ئافرەتانی دوای پێغەمبەر (ﷺ)

پێشتر ئاماژەمان پێدا کە یەکێک لەو بابەتە مەزنانەی ئافرەتان پێیەوە سەرقاڵبوون لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)، بابەتی زانست و فێربوون و تێگەشتن بوو لە ئاین.

ئەگەر سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)، سەردەمی وەرگرتنی زانست بوویێت؛ ئەوا سەردەمی ئافرەتانی دوای خۆی (ﷺ)، سەردەمی بەخشینی زانست بووە. لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ)، ئافرەتان بەخۆبونیادنانەوە سەرقاڵبوون، بەڵام لەدوای پێغەمبەرەوە (ﷺ) سەرقاڵبوون بە بەخشینی ئەوەی لەسەری بونیادنرابوون.

دەمەوێت لێرەدا شتێکی گرنگ بڵێم، ئەویش ئەوەیە ئەو نموونانەی کە باسی دەکەم لێرەدا، هەرئەوەندە نییە، بەڵکوو نموونەی زۆرترمان هەن. من تەنیا کۆمەڵێک لە نموونەکان باس دەکەم وەکوو جەختکردنەوەیەک بۆ ئەو بابەتەی زانست و فێربوون کە پێشتر باسمان کرد و بەڵگەمان بۆهێنایەوە لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ)، بۆئەوەی کەس نەڵێت ئەم باسە تەنیا لەسەر هەندێک نموونەی سەردەمی (ﷺ)، بنیاتنراوە. نەخێر؛ پێغەمبەر (ﷺ) ئەم بابەتەی بەتەواوی لە دەروونیاندا بنیات نابوو.

دوو بوار باس دەکەم سەبارەت بە بابەتی زانست و فێرکردن لە سەردەمی

پێغەمبەردا (ﷺ):

بواری یەکەم: بواری گەیاندنی زانست و جێبەجێکردنی.

بواری دووەم: بواری چارەسەری کێشە زانستییەکان و چارەسەری ئەو بابەتە تازانەی دەهاتنە پێشەوە و هەروەها ئاراستەکردنیان لەو بابەتەدا.

بواری یەکەم: بواری گەیاندن و جێبەجێکردن

بێگومان هەر وتەیەک لەژێر ئەم ناونیشانە ڕاستەوخۆ دایکە عائیشە دێنێتە بیر و هۆشت. دایکە عائیشە لە شەش پەڕتووکەکەی فەرمووده (٢٠٨١) فەرموودەی هەیە، هەروەها خەڵکانێکی زۆر فەرموودەیان لێیەوە گێڕاوەتەوە، کە زۆربەیان پیاوانن. جگە لەوانەش؛ هەندێک لە پیاوان -چ ئەوانەی نزیکی خۆی بوون یاخود فێرخوازان- نەک فەرموودەیەک بەڵکوو زۆر فەرموودەیان لێوە گێڕاوەتەوە: بۆنموونە ئەسوەدی کوڕی یەزید -کە لە تابیعینە چاک و گەورە و بەڕێزەکانە، هەروەها لە هاوەڵانی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودە- ئەم پیاوە لە دایکە عائیشەوە (١١٧) فەرموودەی گێڕاوەتەوە.

ژمارەی ئەو ئافرەتانەی کە لە شەش پەڕتووکەکەی فەرموودە، ناویان هەیە و فەرموودەیان گێڕاوەتەوە (١١٥) ئافرەت بوون، کە دەڵێین: «گێڕاویانەتەوە» واتا گەیاندوویانە و هەستاون بە ئەرکی خۆیان. ئەمەش وردەکاری تێدایە؛ هەندێک لە ئافرەتان منداڵەکانی خۆیان لێیان گێڕاونەتەوە، هەندێکی دیکە زۆربەی خەڵکی، هەندێکی دیکە هاوەڵە پیاوەکان لێیان گێڕاونەتەوە، هەندێکی دیکە تابیعین، بەڵام زۆربەی ئافرەتەکان بەناوبانگ بوون بە فەرموودە گێڕانەوە و زۆر جۆری خەڵکی فەرموودەیان لێیانەوە گێڕاونەتەوە.

سا ئێستا سەرنجی ئەم کەمبوونەوەیە بدەن: ئێمە وتمان (١١٥) ئافرەت

-بەنزیکی- لە شەش پەڕتووکەکەی فەرمووده ناویان هاتووه و فەرموودەیان گێڕاوەتەوە، ئەمە تەنیا لە یەک چین (چینی هاوەڵان) لە چینی تابیعین؛ کە تابیعین خۆی چەند چینێکە، دوای ئەوان تابیعی تابیعین کە ئەوانیش چەند چینێکن. لە هەموو چینەکانی دووەمی دوای هاوەڵان تاوەکوو سەردەمی خاوەنی شەش پەڕتووکەکەی فەرمووده؛ تەنیا (١٠٣) ئافرەت نەبێت فەرموودەیان نەگێڕاوەتەوە. کەچی ئافرەتە هاوەڵەکان بەتەنیا (١١٥) بەڵام دوای ئەوان: هەموو سەردەمی تابیعین و دوای تابیعین و دواتر، هەموویان پێکەوە (١٠٣) ئافرەت نەبێت فەرموودەیان نەگێڕاوەتەوە. واتا ژمارەی ئەو ئافرەتە هاوەڵانەی کە فەرموودەیان گێڕاوەتەوە، لە یەک سەردەمدا، زیاترە لە کۆی ئەو ئافرەتانەی دیکە کە لەدوای ئەوان هاتوون لە وڵاتە جیاوازەکان تاوەکوو سەردەمی خاوەنانی شەش پەڕتووکەکە.

کۆی ئەو فەرموودانەی کە ئافرەتان گێڕاویانەتەوە لە شەش پەڕتووکەکەدا: (١٧٦٤) فەرموودەیە؛ کە (١٥٣٩) لەلایەن ئافرەتە هاوەڵەکانەوەیە، سەرنجی ئەم جیاوازییە گەورەیە بدەن.

ئەو ئافرەتە هاوەڵانەی کە ناسراو بوون بە زۆر گێڕانەوەی فەرمووده و بڵاوکردنەوەی زانستی پێغەمبەری (ﷺ)، هەروەها ناودارن بەوەی خەڵکێکی زۆر سوودی لێیان وەرگرتووە، ئەمانەن:

- دایکە عائیشە
- ئوم سەلەمە
- مەیموونە و جگە لەوانیش

هەرکەسێکیش ویستی زانینی وردەکاری زیارتری هەیە با سەیری پەڕتووکی (تهذیب الکمال) بکات.

ئوم عەتییە کە لە باسی سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) پێیدا تێپەڕین، ئەوەی وتی: «ئێمە لەگەڵ پێغەمبەردا غەزامان دەکرد، بریندارانمان تیماردەکرد ...» کۆمەڵێک لە هاوەڵان و تابیعین لە بەسرە هاتبوونە خزمەتی؛ باسی چۆنییەتی شۆردنی مردوویان لێوە وەردەگرت؛ چوون هەروەک لە «بوخاری و موسلیمدا» گێڕدراوەتەوە، ئوم عەتییە بووە کە منداڵەکەی پێغەمبەر (زەینەب)ی (ﷺ) دەشۆرد[1]. لە فەرموودەکەی بوخاریدا هاتووە، پێغەمبەر (ﷺ) بە ئوم عەتییە و ئەوەی لەگەڵیدابوو فەرموو: «لەلای ڕاست و شوێنی دەستنوێژیەوە دەست پێ بکەن.» تا کۆتایی. ئەو ئافرەتە ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە، هەر بۆیە کۆمەڵێک لە هاوەڵان و زانایانی تابیعین لە بەسرەوە هاتبوون ئەم فەرموودەیان لێوە وەرگرت کە باسی شۆردنی مردوو دەکات.

بواری دووەم: بواری چارەسەری کێشە زانستییەکان و چارەسەری ئەو بابەتە تازانەی دەهاتنە پێشەوە و هەروەها ئاڕاستەکردنیان لەو بابەتانەدا

وەک دەزانن کە پەڕتووکی (تهذیب التهذیب)ی ئیبن حەجەر لە پەڕتووکە سەرەکییەکانە لە باسی گێڕەرەوەکانی فەرموودە و ژیاننامەیان. لەو پەڕتووکەدا باسی مەسروق کراوە کە ئەم مەسرووقە لە گرنگترین تابیعینەکان بووە لە ڕووی زانست و کردەوە و بەخشینەوە، هەروەها لەو شەرعزانە بەڕێزانە بوو کە هاوەڵی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود بوو و لە دایکە عائیشەوە زانستێکی زۆری گێڕاوەتەوە ...

---

(١) پێشەوا بوخاری بە ژمارە (١٢٥٦) و، پێشەوا موسلیم بە ژمارە (٩٣٩) گێڕاویانەتەوە.

مەسروق دەڵێت: «هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، ئەوانەی دواتر بوون بە شێخی گەورە، دەمبینین کە چۆن دەربارەی فەرزەکان پرسیاریان لە دایکە عائیشە دەکرد.»

هەروەها ئەبوو موسای ئەشعەری دەڵێت: «ئێمەی هاوەڵی پێغەمبەر (ﷺ) لە هەرشتێکدا کێشەمان هەبووایە و پرسیارمان لە دایکە عائیشە بکردایە، ئیلا لەلای ئەو زانستمان دەربارەی دەستدەکەوت.»

هەروەها عەتای کوڕی ئەبی ڕەباح دەڵێت: «دایکە عائیشە شارەزاترین کەس بوو، هەروەها چاکترین ڕاوبۆچوونی هەبوو لەنێو خەڵکیدا.»

هەربۆیە کە دایکە عائیشە ئەم وەسفانەی دەربارەی کرابێت، ئەوا نابێت پێمان نامۆ و سەیربێت کە ئەو قوتابییە ئافرەتانەشی زانستیان لە دایکە عائیشەوە وەرگرتووە، هەمان توانا و زانستیان تێدا بەرجەستەبووە.

بۆنموونە:

١ـ دیارترین قوتابی دایکە عائیشە؛ عەمرەتی کچی عەبدولڕەحمانە، کە لە (تهذیب التهذیب)دا هاتووە: «کوڕ و برا و برازا و کوڕەزا و کوڕی برازا، یەحیا و سەعد کوڕانی سەعیدی کوڕ قەیسن عوروەی کوڕی زوبەیر، سلێمانی کوڕی یەسار، زوهری، عومروی کوڕی دینار و چەندانی تر، لێیەوە فەرموودەیان گێڕاوەتەوە.»

ئەحمەدی کوڕی موحەممەدی کوڕی بەکری موقەدەمی دەڵێت: «لە ئیبن مەدینییەوە بیستم کە لە پێشەوایانی زانستی جەرح و تەعدیلە. باسی عەمرەتی کچی عەبدولڕەحمانی کرد و باسکردنی ئەوی بە گەورە گرت

و وتی عەمرەت یەکێکە لە جێمتمانەترین سەلمێنەرترین زاناکان بە زانستی دایکە عائیشە.» ئیبن سەعد خاوەنی پەڕتووکی (الطبقات)ـە کە یەکێکە لە گەورەترین پەڕتووکەکانی ژیاننامە. دەربارەی عەمرەت دەڵێت: «ئەو کەسێکی زانا بوو.»

هەروەها کاتێک دەربارەی یەکێک لە پایەکانی سوننەت و فەرموودەگێڕەوە و یەکێک لە گەورەترین پێشەوایانی تابیعین (پێشەوا زوهری) دەخوێنیتەوە، دەبینیت شێخی زۆری هەبووە، لە دیارترین شێخەکانیشی عەمرەتی کچی عەبدولڕەحمانی قوتابی دایکە عائیشەیە، فەرموودەیەکی زۆری لێ گێڕاوەتەوە کە لە بوخاری و موسلیمیشدا هاتوون، لە پەڕتووکی (موطأ)ی پێشەوا مالیکیشدا سەنەدی: «زوهری لە عەمرەتەوە و ئەویش لە دایکە عائیشەوە» لە ڕاستترین سەنەدەکانە، لەڕێی ئەم سەنەدەشەوە زانستێکی زۆرمان بەدەست گەشتووە.

جگە لەمانەش، خەلیفە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز نووسراوێکی نارد بۆ ئیبن حەزم ـمەبەست ئیبن حەزمی نەوەی دواتر نییەـ کە فەرموودەکانی عەمرەتی بۆ بنووسێت. بەڕاستی ئێمە نەداری ئافرەتی زانا و شەرعزانی پێگەدارین، ئافرەتانی شەرعزان و زانا و مامۆستامان دەوێت کە ئافرەتان فێر بکەن، یارمەتییان بدەن لە چارەسەرکردنی ئەو کێشە تازانەی کە دێنە ڕێی ئافرەتان، هەروەها یارمەتییان بدەن لەوەی توانای گەیاندنی زانستێکیان هەبێت و بتوانن زانستێک بگوازنەوە بۆ خەڵکی دیکە ...

باسکردنی ئەم نموونانە: فەرموودەکانی عائیشە خاتوون، ئوم سەلەمە و قوتابییەکانیان، بابەتەکە تەنیا پەیوەست نییە بە ئافرەتەوە، بەڵکوو ئەمە لە چوارچێوەی هەڵگرتنی خەمی ئیسلامدایە (گەیاندنی زانست) فەرموودەکانی

دایکە عائیشە بەتەنیا دەربارەی حوکمەکانی ئافرەت نییە، فەرموودەکانی دایکە عائیشە دەربارەی زانستە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ)، کە لەلایەکەوە خزمەت بە بابەتێکی گەورەی پەیوەست بە زانست دەکات، لەلایەکی تریشەوە خزمەتی سێیەم بابەتی مەزن دەکات، کە پەیوەستە بە هەڵگرتنی خەمی ئیسلام و سەرخستنی.

٢ـ لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە کە فەرموودەگێڕەوەیەک بە ناوی موسلیم وتی: «پرسیارم لە ئیبن عەبباس کرد دەربارەی موتعەی حەج؟ (شێوازێکی حەجج کردنە) مۆڵەتی دا، بەڵام ئیبن زوبەیر ڕێگری دەکرد.»[1] واتا ڕاجیایی هەبوو لەنێوانیاندا، ئیبن عەبباس وتی: «دایکی ئیبن زوبەیر -ئەسمای کچی ئەبوبەکر- دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) مۆڵەتی داوە، دواتر کە چوونە خزمەتی و پرسیاریان لێ کرد، موسلیم دەڵێت: چووینە ژوورەو بۆ لای، ئافرەتێکی گەورە و کوێر بوو، ئافرەتەکە وتی پێغەمبەری خودا (ﷺ) مۆڵەتی داوە.»

ئەمەش نموونەی ئەو ئافرەتانەی دوای پێغەمبەر (ﷺ) بوون، کە ڕۆڵیان هەبوو لە ئاراستەکردنی خەڵکی لەکاتی هەندێک کێشەی زانستی و هاتنە پێشەوەی هەندێک بابەتی فیقهی تازە، نموونەی تر زۆرن، بەڵام ئێمە دەمانەوێت تەنیا ئەو نموونانە بزانرێت کە پێغەمبەر (ﷺ) بەرهەمی هێنان، هەربۆیە وەکوو بەشێک لە شوێنکەوتنی پێغەمبەر (ﷺ)، دەبێت گرنگی بدرێت بە وانەی زانستی بۆ ئافرەتان و بەرهەمهێنانی نموونەی زانستی پێشکەوتوو.

---

(١) «عن مسلم القري، قال: سألت ابن عباس رضي الله عنهما عن متعة الحج؟ فرخص فيها، وكان ابن الزبير ينهى عنها، فقال: هذه أم ابن الزبير، تحدث أن رسول الله ﷺ رخص فيها، فادخلوا عليها، فاسألوها، قال: فدخلنا عليها، فإذا امرأة ضخمة عمياء، فقالت: قد رخص رسول الله ﷺ فيها.» پێشەوا موسلیم گێڕاویەتییەوە بە ژمارە (١٢٣٨)

## بەشی سێیەم: چەند نموونەیەکی دیکە لەسەر ئەو ئافرەتانەی دوای پێغەمبەر (ﷺ)، دەربارەی خزمەتکردنی ئیسلام و موسڵمانان لە بوارەکانی دیکەی جگە لە زانست.

بواری زانست تەنیا بەشێک بوو لەو ڕۆڵەی کە ئافرەتانی دوای پێغەمبەر (ﷺ) پێی هەڵدەستان لەپێناو خزمەتکردنی ئیسلام و موسڵمانان. ئەم نموونانەش، ئامانج لە باسکردنیان گەیشتن نییە بەو ئاستی جێبەجێکردنەی کە پێی هەڵدەستان، چونکە ئەو کۆمەڵە تایبەت بوون و بەم کەمتەرخەمییەی خۆشمان لە شوێنکەوتن، گەیشتن بە ئاستی ئەوان ئەستەمە، بەڵام بەلای کەمەوە دەمەوێت بزانین کە قوتابخانەی پێغەمبەری چی بەرهەم هێنا؟!

نموونەکان:

١ـ ئوم عەممارە

کە ناوی نوسیبەی کچی کەعبە، پێشەوا زەهەبی لە پەرتووکی (سير أعلام النبلاء) دەربارەی دەڵێت: «ئوم عەممارە لەم شوێنانەدا ئامادەیی هەبووە: شەوی عەقەبە، جەنگی ئوحود، حودەیبییە، جەنگی حونەین و یەمامە، هەروەها جیهادی کرد، کارگەلێکی زۆری کرد، فەرموودەیان لێوە گێڕاوەتەوە، دەستێکیشی لە جیهاددا بڕدراوە!»

هەروەها بەشێوەیەکی ورد باسی شەڕکردنی کراوە لە جەنگی ئوحوددا: «ئوم عەممارە لە جەنگی ئوحوددا دوازدە برینی پێوە بوو، دەستەکانی لە جەنگی یەمامە بڕدرا، هەروەها لە جەنگی یەمامە جگە لە دەستی، یازدە برینی پێوە بوو، بەو بارودۆخەوە گەڕایەوە بۆ مەدینە و گیانی بریندار بوو، ئیمامی ئەبوو بەکر کە ئەو کات خەلیفە بوو، بینرا کە بەدوایدا دەگەڕێت و پرسیاری لەبارەوە دەکات.»

## ٢ـ ئەسمای کچی ئیمامی ئەبوو بەکر

لە نموونەی ئەو ئافرەتانەیە کە لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ)، بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر واتای شکۆ و دەروونبەرزی لە دەروونیدا چانراوە، هاوشێوەی ئەم ئافرەتە شکۆدارە، کە هیچ بەندایەتییەک نازانێت جگە لە بەندایەتی بۆ خودا نەبێت و داننانێت بە کاریگەری دەرەکی دیکەی جگە لەو خودا، قورسە کە لە دەرەوەی قوتابخانەی پێغەمبەریدا، دووبارە ببێتەوە.

ئەم ئافرەتە لە کۆتایی تەمەنیدا مەوقیفێکی سەیری تووش بوو، کە ئیمامی موسلیم لە سەحیحەکەیدا هێناوییەتی، ئەبوو نەوفەل دەڵێت: «عەبدوڵای کوڕی زوبەیرم بینی کە لە دەروازەی مەدینە هەڵواسرا بوو دوای ئەوەی حەجاج کوشتبووی و هەڵیواسیبوو. : «وای کرد کە قورەیش و خەڵکی بەلایدا تێبپەڕن، تا ئەوکاتەی عەبدوڵای کوڕی عومەر بەلایدا تێپەڕی و لەلای وەستا و وتی: سەلام علیک ئەبا خوبەیب، سەلام علیک ئەبا خوبەیب، سەلام علیک ئەبا خوبەیب، وەڵڵاهی من ڕێگری ئەمەم لێ دەکردی سێ جار وتی وەڵاهی ئەوەی دەربارەی تۆ زانییومە ئەوەیە بە ڕۆژ بەڕۆژوو دەبوویت و شەوان شەونوێژت دەکرد و پەیوەندی خزمایەتیت دەگەیاند، وەڵڵاهی ئوممەتێک ئەگەر تۆ خراپەکەیان بیت کە ئەوان پێیان وایە، ئەوا باشترین ئوممەتە.» دواتر تێپەڕی، کە ئەم مەوقیفەی ئیبن عومەر بە حەجاج گەشتەوە، ناردی بە شوێن لاشەکەیدا و دایانگرت و لە گۆڕستانی یەهوودییەکان ناشتیان، دواتر ناردی بە شوێن دایکیدا کە ئەسمایە بۆ ئەوەی بێت بۆ لای، بەڵام ئەسما ڕەتی کردەوە، دواتر حەجاج تووڕە بوو، وتی: «پێی بڵێن دێت، یان بە قژی پەلکێشی بکەم بۆ لای خۆم!» ئەسماش بە نێردراوەکەی وت کە بە حەجاج بڵێت: «وەڵڵاهی نایەم بۆ لات با بزانم کێ دەنێری تا بە قژ پەلکێشم بکات.» دواتر حەجاج

داوای نەعلەکانی کرد و بە فیز و خۆبەگەورەزانینەوە و تووڕەییەوە بەڕێ کەوت، چووە ژوورەوە بۆ لای ئەسما و پێی وت: «پێت چۆن بوو دەربارەی ئەوەی کردم بە دوژمنی خوا؟» (مەبەستی کوڕەکەی بوو عەبدوڵای کوڕی زوبەیر)، ئەسماش وەڵامی دایەوە: «بینیم تۆ ژیانی دونیای ئەوت تێک دا، بەڵام ئەو ژیانی دوارۆژی تۆی لەناو برد!» دواتر بە گاڵتە و سووکایەتییەوە بە ئەسمای وت: «پێم گەیشتووە کە بە تۆ دەڵێن خاوەنی دوو پشتوێنەکە.» ئەسماش بەوپەڕی شکۆ و عیززەتەوە وەڵامی دایەوە و وتی: «پشتوێنێکم هەبوو کە خواردنم پێی هەڵدەگرت بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) و پشتوێنەکەی تریشم ئەوەیە کە هەموو ئافرەتێ پێویستییەتی.»

دواتر ئەسما وتی: «پێغەمبەری خودا (ﷺ) پێی فەرمووین کە لە ناوچەی سەقیفدا درۆزنێک و ستەمکارێک دەردەکەون، درۆزنەکەمان بینی و ستەمکار و وێرانکەرەکەش گومانم بۆ کەس ناچێت جگە لە تۆ.» ئیتر حەجاج هەستا و نەگەڕایەوە.

## بەشی چوارەم: نموونەی ئەو ئافرەتانەی کە هەڵگری بابەتی زانست و فێرکردن بوون

پێشتر ئاماژەمان بە قوتابییەکانی دایکە عائیشە کرد، وەکوو عەمرەتی کچی عەبدولڕەحمان، لێرەشدا تەنیا لەسەر نموونەیەک دەوەستین: «کەریمە مەڕووزی»یە، ئەم ئافرەتە لای زانایانی فەرمووده زۆر باس دەکرێت، لەبەرئەوەی لە گرنگترین فەرمووده گێڕەرەوەکان بوو، گرنگترین فەرمووده گێڕەرەوە لە سەحیحی بوخاریدا، «فیرەبری» کە ڕاستەوخۆ لە بوخارییەوە فەرموودەی

گێڕاوەتەوە، دوای ئەو کۆمەڵێک لێیان گێڕاوەتەوە لەوانەش «کوشمی‌هەنی» کە کەریمەت مەڕووزیە قوتابی ئەو بووە.

لەو سەردەمەشدا ڕێگەی وەرگرتنی فەرموودە (سەحیحی بوخاری) زۆر گرنگ بوو، کە ئەمەش خۆی وەڵامێکە بۆ ئەو گومانەی کە دەڵێن: «هیچ نوسخەیەک نییە لە سەحیحی بوخاری کە بە دەستنووسی بوخاری مابێتەوە.» لەبەرئەوەی سیستەمی ئەو کات وەکوو ئەمڕۆ نەبوو، هیچ پەڕتووکخانەیەک نەبوو کە پەڕتووکیان بۆ بنێرێت، یاخود بۆیان چاپ بکات، بەڵکوو کۆی ڕێگاکە ئەوە بوو کە خاوەنی پەڕتووکەکە بەسەر قوتابییەکانی دەخوێندەوە و ئەوانیش دەیاننوسی، کە لە ڕووی زەبتکردنیشەوە، جیاوازی هەبوو لەنێوانیاندا، ئەم ئافرەتەچاکە سەنەدی (سەحیحی بوخاری) دەگاتەوە پێی، هەربۆیە فەرموودە گێڕەرەوەکان لە زۆربەی وڵاتە جیاوازەکان گەشتیان دەکرد بۆ لای لە مەککە بۆئەوەی (سەحیحی بوخاری) لەلایدا بخوێننەوە و ڕێزی ئەوەیان بۆ ببێت کە عەرزی (سەحیحی بوخاری)یان کردووە.

لە پەڕتووکی (سیر أعلام النبلاء)، زەهەبی دەڵێت: «شێخێک و زانایەکی چاکەکارە، هەروەها خاوەن سەنەدە، کە ئەویش دایکی بەڕێز کەریمەتی کچی ئەحمەدی کوڕی موحەممەدی کوڕی حاتەمی مەڕووزی، لە کەعبەدا نیشتەجێ بوو، لە ئەبی هەیسەمی کوشەیمی سەحیحی بوخاری بیستووە، هەروەها لە زاهریش بیستوویەتی ... تا کۆتایی،» ئافرەتێکی تێگەیشتوو و خاوەن زانیارییە و خواپەرست و چاکەکاریش بووە، چەندین جار سەحیحی بوخاری گێڕاوەتەوە.

«خەتیب بەغدادی» کە یەکێکە لە گەورەترین زانایانی فەرموودە لە

مێژوودا، خاوەنی پەڕتووکی (تاريخ بغداد)، (الكفاية)، (الفقيه والمتفقه)، ئیبن حەجەڕ دەربارەی دەڵێت: «کەم زانست هەیە لە زانستەکانی فەرموودە، مەگەر نووسراوی هەیە لەسەری.» خەتیب «سەحیحی بوخاری» بەتەواوی بەسەر کەریمەدا خوێندووەتەوە، لە چەند ڕۆژێکی دیاریکراو کە هەندێک دەڵێن لە ماوەی پێنج ڕۆژدا.

زەهەبی دەڵێت: «بە کچی مرد و شووی نەکرد!»

ئەبوویەکری سەمعانیش دەڵێت: «لە باوکمم بیست باسی کەریمە دەکات و دەڵێت ئایا هیچ مرۆڤێک هاوشێوەی کەریمە بینراوە؟!»

## بەشی پێنجەم: نموونەی ئەو ئافرەتانەی کە خەمی ئیسلام و سەرخستنیان هەڵگرتووە، لە مێژووی ئیسلامیدا

پێشەوا ئیبن کەسیر لە پەڕتووکی (البداية والنهاية)دا دەڵێت: «لە ساڵی ٧١٤ی هـ. شێخی چاکەکاری خواپەرستی گۆشەگیر ئوم زەینەب، فاتیمەی کچی عەباسی کوڕی ئەبی فەتحی کوڕی موحەممەدی بەغدادییە، بە ڕواڵەت نافرەتێکی بەهێز بوو، خەڵکانێکی زۆر شایەتییان بۆ داوە، هەروەها لە زانا و چاکەکارەکان بوو کە فەرمانی دەکرد بە چاکە و ڕێگری دەکرد لە خراپە، ڕێگری دەکرد لە فکری گرووپی «ئەحمەدی»یە کە گرووپێکی سۆفی بوو و بڕوایان بە برایەتی نافرەتان هەبوو، لەگەڵ کۆمەڵێکی گومڕای دیکە بە ناوی «موڕدان» بە جۆرێک بەو ڕێگریکردنە هەڵدەستا، کە زۆر پیاو ئەو توانایەی ئەویان نەبوو.»

هەروەها ئامادەی دانیشتنگەی شێخ ئیبن تەیمییە دەبوو و سوودێکی زۆری

لەو و جگە لەویش بینیوە، پێشەوا ئیبن کەسیر دەڵێت: «لە ئیبن تەیمییەم بیستووە کە وەسفی دەکرد بە چاکەکار و خاوەن زانست، هەروەها باسی دەکات کە زۆر، یاخود لە زۆربەی باسەکانی (المغني) ـگەورەترین مەوسوعەی فیقهی بەراوردە و پانزە بەرگە. ئامادەیی هەبوو، ئیبن تەیمییە لەبەر زۆری بابەت و جوانی پرسیارەکانی و خێرایی تێگەیشتنی ئەم ئافرەتە، پێش ئەوە خۆی ئامادە دەکرد، جگە لەوانەش زۆر ئافرەت لەسەر دەستی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزیان تەواو کردووە.»

هەموو مرۆڤێک بە گوێرەی ئەو شتەی کە خۆی بایەخی پێ دەدات، لەم بابەتە دەڕوانێت، هەندێک لە ڕووی ئاستی زانستی، گرنگیدان بە ئیسلام، هەستان بە ئەرکت فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە و هەندێکی تر لەلایەنی دیکەوە لێی دەڕوانن، بەڵام دەکرێت ئەم بەسەرهاتە وەکوو خۆی وەربگیرێت و لاسایی ئەو واتایانە بکرێتەوە، کە لەخۆی گرتووە، ئەوەتا ئافرەتێک شتی لەبەرکردووە و تێگەیشتنێکی باشی هەبووە، لە خزمەت ئیبن تەیمییە و وانەکانیدا ئامادە دەبوو، بەشداری دەکرد بە پرسیارکردن و ئیبن تەیمییەش خۆی بۆ ئامادە دەکرد و وەسفی دەکرد، لە ڕووی کردەییەوە سوودی لە ئیبن تەیمییە بینیوە، هەر وەک چۆن لە ڕووی زانستیشەوە سوودی لێ بینیوە، فەرمانی دەکرد بە چاکە و ڕێگری دەکرد لە خراپە.

گوشراوی مەبەست: بوار و بابەتی فرە هەن کە پێویستە ئافرەتی موسڵمان پێیەوە سەرقاڵ ببێت، هەروەها ئەم بوار و بابەتانە تەنیا بابەتگەلێکی دونیایی، یاخود مافێکی کەسی نین، کە مرۆڤ لە چوارچێوەیەکدا تەنیا چێژ وەربگرێت، نەخێر ئەمە بابەتی مەزن و مەرکەزی نییە. یاخود ئافرەتی موسڵمان پەراوێز بخەیت و نەهێلیت هیچ ڕۆڵێکی هەبێت، لەکاتێکدا ئێمە لە سەردەمێک داین،

کە ئیسلام و موسڵمانان بە ئامرازی جیاواز بە ئامانج دەگیرێن، هەروەها ئافرەتی موسڵمان بە ئامرازی جیاواز بە ئامانج دەگیرێت، دواتر بێیت و بە ئافرەت بڵێیت: «تۆ کێیت تاوەکوو پەیوەندیت هەبێت بە سەرخستنی ئیسلام و موسڵمانان! بە لای زۆرەوە ئەوەی لەسەرت بێت، تەنیا چێشتکردنە!» ئەگەرچی بوون بە ئافرەتێکی چاکەکار دژیەک نییە لەگەڵ هەستانی بە ئەرکەکانی ماڵەوە، بەڵام مەبەستەکە ئەوەیە کە ئەو بەتەنیا بۆ ئەم پیشەیە دروست نەکراوە، بەڵکوو لە چوارچێوەی ئەو ژیانەی تێیدایە، هەڵدەستێت بە کار و ئەرکی شەریعەت، سا ئیتر هەستان بێت بە مافی منداڵەکانی، یاخود پیاوەکەی، یاخود مافی خودی خۆی. ئەو پێش هەموو شتێک ئافرەتێکی موسڵمانە، بۆیە کاتێک دەق و پەیامێکی شەریعەت دێت بۆ هەڵگرتنی خەمی ئیسلام، ئافرەتیش بە هەمان شێوەی پیاو، دوێنراوە، بەڵام لە هەندێک بابەتدا کە دەقی لەسەر هاتووە، جیاکاری دەکرێت، وەکوو: فەرمانڕەوایەتی و سەرکردایەتی سوپا و هەروەها جیهاد لەسەری نەکراوە بە ئەرک، ئەگەرچی هەندێک لە ئافرەتان بەشدارییشیان کردووە.

لە سەردەمی خۆشماندا گونجاوی و پێویستی کارکردنی ئافرەت زۆر گەورەتر و زیاترە لە گونجاوی و پێویستی سەردەمەکانی پێشووتر، بەڵام بابەتەکە لەوەدایە ئاخۆ ئەو ئامانجە و ڕازیبوون بەو ئامانجەی هەیە، هەروەها ئاخۆ خەمی هەڵگرتنی ئەم پەیامەی لەلا هەیە؟ هەربۆیە کاتێک کە پەی بەوە دەبات بەرپرسیارییەتی لەسەرە، هەرچەند لە توانایدا هەبێت، پێشکەشی دەکات، گرنگترین بەرپرسیارییەتی لە ماڵەکەیدا: فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگریکردنە لە خراپە، نەک بەتەنیا خواردن و خواردنەوە، هەربۆیە لە لێکدانەوەی ئەم فەرموودەیە: «ئەگەر حەوا نەبوایە هەرگیز مێ ناپاکی لە پیاوەکەی نەدەکرد.»

(ئەم فەرموودەیە بەپێی سایتی ئیسلام ویب دروست نییە بەبەڵگەی ـ ئەوەی زانایانی پێشین باسیان لێوە نەکردووە).

لە دیارترین لێکدانەوە لەلای زانایان بۆ ئەم فەرموودەیە، ئەمەیە: سروشتی ئەو ناپاکییەی حەوا لە ئادەم، ڕێگرینەکردنی بوو لەو خراپەیە، بێدەنگ بوو و بێدەنگییەکەش بووە هۆی ئەوەی کە بیخوات، هەربۆیە یەکێک لە ڕۆڵەکانی ئافرەت لەنێو ماڵەکەیدا ئەوەیە کە ڕێگری خراپە بکات لە خێزانەکەی.

بەڵام پرسیارەکە لەودایە ئاخۆ دەربارەی تاک بە تاکی ئەو شتانەی پێویستە لەسەری، لەگەڵی بدوێم؟ یاخود بە واتایەکی گشتی و پێگەیەکی مەزن کە دەروونێکی باوەڕدار و شکۆداری گەورە و زیندوو لەسەری بونیاد بنێت، کە دواتر بە خۆشەویستی و ڕێزەوە وەڵامی هەرشتێک دەداتەوە کە خودا بیەوێت، ئەگەرچی پێچەوانەی ئارەزووەکانیشی بێت. ئەمڕۆ ئێمە لە سەردەمێکداین کە ئاستی خۆبەدەستەوەدان بۆ دەقە شەرعییەکان لاوازبووە و کێشە و گومانەکان زۆر بوونە، جگە لەو پەیامە هەڵانەی پەیوەست بە ئافرەت بە ناوی ئایینەوە بڵاو دەکرێتەوە، کەچی لەدوای هەموو ئەمانەش، دێین دەمانەوێت بارودۆخەکە بەم شێوەیە چاک بکەین: «فڵانە کار بکە و فڵانە کار مەکە، ئەگەرچی پێت خۆش بێت، یاخود نا!» هەر لەبەرئەوەیە کە دەبێت پەیامەکانمان هۆشیاری تێدا بێت و بەشێوەیەکی گشتی لە بابەتە تێبگەین.

# ئافرەت و نەخشەی بەرپرسیارییەتییەکان

وەکوو پێشتر بەڵێنمان دا کە لە سەرەتای هەر بابەتێک، کۆمەڵێک پێشەکی باس بکەین، کە بەشێوەیەکی گشتی وەکوو ڕێکخەرێک دەبێت بۆ بابەتەکە، ئەو پێشەکیانەی لێرەدا باسی دەکەین زانستی نین، بەڵکوو ڕوونکەرەوەن.

پێشەکییەکان:

١ـ لە گرنگترین بەرهەمەکانی بیرۆکەی نەخشەی بەرپرسیارییەتییەکان ئەوەیە: ئافرەت پەی ببات بە فراوانی ئەو ڕووبەرەی کە دەکرێت شتی تێدا پێشکەش بکات، یان کاری تێدا بکات، یاخود لەڕێگەیەوە لە خودا نزیک ببێتەوە.

هەربۆیە ڕووبەری پەیوەست بە ئافرەت لە ڕووی بەرپرسیارییەتی و ئەرکەکانەوە، ڕووبەرێکی زۆر فراوانە، وەکوو ئەوە نییە کە بانگەشەی بۆ دەکرێت گوایە ڕووبەری بەرپرسیارییەتی ئافرەت لە یەک دوو بەرپرسیارییەتی ماڵ، یاخود پیاوەکەی نەبێت تێپەڕ ناکات.

٢ـ فراوانی نەخشەی بەرپرسیارییەتی و ئەرکەکان، دەکرێت وەکوو ڕاسپاردن (مکلف)ـێکی قورس لێی بڕوانرێت و هەروەها دەکرێت وەکوو ڕووبەرێک لە ڕێزلێنان لێی بڕوانرێت (ڕووبەرێک کە چەند ئەسپی خۆت زیاتر تاو بدەی، هێندە ڕێزلێنانت پێ دەبەخشرێت.)

٣ـ بنچینە لەو پەیامانەی قورئان، کە دەربارەی ڕاسپاردنەکان هاتوون، یەکسانییە لەنێوان پیاوان و ئافرەتاندا (واتا هەم پیاوی پێ ڕاسپێردراوە، هەم ئافرەت.)

بەڵام ئێمە لێرەدا زیاتر تیشک دەخەینە سەر ئەو ئایەتانەی کە ئاماژەی بە ئافرەت کردووە.

تێبینییەکی گرنگ: ئەو ئایەتانەی کە باسی ئافرەتی تێدایە واتای ئەوە نییە کە بەتەنیا ئافرەتی پێ دوێندراو بێت و پیاوان نەگرێتەوە، نەخێر، بەڵکوو مەبەستەکە ـلەبەرئەوەی بابەتەکە پەیوەستە بە ئافرەتەوەـ هەوڵدانە بۆ تیشک خستنە سەر ئەم واتایە.

٤ـ کاتێک خوێندنەوەم بۆ ئەرکەکانی ئافرەت کرد و لە نەخشەی ئەرکەکانی ئافرەتم ڕوانی، بۆم دەرکەوت کە دەکرێت زۆربەی ئەرکەکانی ـبۆئەوەی نەڵێم هەمووی ـ لەژێر چەتری سێ بەرپرسیارییەتی مەزن کۆ بکرێتەوە.

واتا ئافرەت سێ بەرپرسیارییەتی مەزنی لەسەرە، کە لەژێر هەر بەرپرسیارییەتییەک گورزەیەک لە ئەرکی تر هەن، ئایا چەتری چوارەم یاخود بەرپرسیارییەتی چوارەم هەیە؟ دەکرێت هەبێت، خوێندنەوەکەم واتای تەواوی ناگەیەنێت، بەڵام ئەم سێ بەرپرسیارییەتییە لە دیارترین بەرپرسیارییەتییەکانە کە بۆم دەرکەوتن.

٥ـ ئەو ئەرکانەی کە لەژێر چەتری هەر بەرپرسیارییەتییەکدا باسی دەکەم، بەشێوەی سنووردارکردن و کورتهەڵنەهێنان لەوانەدا باس ناکرێت.

واتا ناڵێم لەژێر چەتری ئەم بەرپرسیارییەتییە بەتەنیا فلانە ئەرک و فلانە ئەرک هەیە، نەخێر، بەڵکوو لەژێر هەر بەرپرسیارییەتییەکدا کۆمەڵێک ئەرک، یاخود کار هەن، ئەگەرچی لە شەرعیشدا نەکرابن بە ئەرک، بەڵام باشە بۆچی باسی ئەرک و کارەکان دەکەم لەژێر چەتری هەر بەرپرسیارییەتییەکدا؟

بۆ چەند ئیعتیبارێک، لەوانەش:

- لە پێشینەیی: واتا ئاماژە بدەم کە چ شتێک لە پێشینەیە.

٦ـ ئەو ئەرکانەی کە لەژێر چەتری هەر بەرپرسیارییەتییەک **ـلە سێ بەرپرسیارییەتییەکەـ** باسی دەکەم، بە واتای ئەوە **نایات کە هەمان ئەرک** ناچێتە ژێر دوو بەرپرسیارییەتییەکەی ترەوە.

واتا کە من باسی ئەرکێکی دیاریکراو دەکەم و دەڵێم: «ئەمە لەژێر چەتری یەکەمدایە.» ئەگەر یەکێک بڵێت: «ئایا ناچێتە ژێر چەتری سێیەمیش؟»

وەڵاممان ئەوەیە: «بەڵێ دەکرێت.»

٧ـ کاتێک لە نەخشەی بەرپرسیارییەتییەکان دەڕوانیت بەهۆیەوە بۆت دەردەکەوێت کە ئافرەت ئەگەر شووی کردبێت، یاخود نا، ئەگەر دایک بێت یاخود نا، ئەوا کۆمەڵێک ڕۆڵی خۆی هەیە کە بیگێڕێت.

کە ئەمەش جیاوازییەکی بنەڕەتی لەگەڵ ئەوانەی توندن لە کەمکردنەوەی ڕۆڵی ئافرەتدا و بەتەنیا ڕۆڵی ئافرەت سنووردار دەکەن لەو کاتەی کە شوو دەکات، لەکاتێکدا ڕۆڵی ئافرەت لە ئیسلامدا لەوە فراوانترە، بۆیە پێویستە نەخشەکە ئەوە تێبپەڕێنێت کە ڕۆڵی ئافرەت بەتەنیا لە چوارچێوەی خێزان و دایکایەتیدا سنووردار بکات.

کەواتە ئەمەیە بەرهەمی نەخشەی بەرپرسیارییەتییەکان: ئافرەت بە جیاوازی بارودۆخەکانییەوە بەرپرسیارییەتی و ئەرکی خۆی هەیە، کە پێی هەڵبستێت و ڕۆڵ ببینێت، هەروەها لەکاتی پەروەردەکردن و ئاڕاستەکردنی پەیام بۆیان، نابێت مێشکی ئافرەت لەوەدا سنووردار بکەین کە ڕۆڵی ئەو کاتێک دەست پێ دەکات کە شوو بکات و خودی ئەو ڕۆڵەش، تەنیا یەک دوو سێ ئەرکە و هیچی دیکە، بێگومان ئەمە کێشەیەکی زۆر گەورەیە!

# سێ بەرپرسیارییەتییە مەزنەکە

## بەرپرسیارییەتی یەکەم: خود بەرپرسیارییەتی

خود بەرپرسیارییەتی بە واتای ئەوە دێت ئافرەتی موسڵمان خودی خۆی دەربازبوونی لە سزای خودا و کۆششکردن لەپێناو بەدەستهێنانی ڕزگاری هەمیشەیی و بردنەوەی دواڕۆژ و هەروەها بەدەستهێنانی خۆشبەختی و کامەرانی، کەواتە خود بەرپرسیارییەتی واتا چ دایک و ئافرەت بێت، یاخود کچ و خوشک بێبەش نابێت لەم بەرپرسیارییەتییە.

هەربۆیە ئەمە چەترێکی مەزنە لە بەرپرسیارییەتییەکان، هەروەها زۆربەی ئەرکەکان کە باس دەکرێت دەچێتە ژێر چەتری ئەم بەرپرسیارییەتییەوە کە ئەوانیش کۆمەڵە ئەرکێکن، پەیوەستن بە خودی ئافرەتەوە، خۆ دەکرێت ئەرکەکان سوودی زۆریان هەبێت جگە لە سوودگەیاندن بە ئافرەتەکە خۆی، بەڵام مەبەستمان ئەرکەکەیە کە پەیوەستە بە خودی ئافرەتەکە خۆیەوە، بەبێ ڕوانین لەوەی چ بارودۆخێکی کۆمەڵایەتی هەیە.

## بەرپرسیارییەتی دووەم: بەرپرسیارییەتی خێزانی

کە ئەم چەترەش بەشێوەکی سەرەکی ئافرەت، یاخود دایک دەگرێتەوە، سا پیاوەکەی مابێت یاخود نا، ئەم بەرپرسیارییەتییە دەیگرێتەوە.

## بەرپرسیارییەتی سێیەم: بەرپرسیارییەتی گشتی

دەکرێت ناویشی بنێین بەرپرسیارییەتی هەڵگرتنی باری خزمەتکردنی ئیسلام کە ئەمەش بەرپرسیارییەتییەکی گشتییە و پەیوەستە بە ئەرکەکانی وەکوو ئافرەتێکی موسڵمان کە پەیوەندی هەیە بە تێکرای خەڵکییەوە و هەروەها بەشێوەیەکی گشتی پەیوەندی بە کاروباری ئیسلامەوە هەیە.

### بەرپرسیارییەتی یەکەم - بەشی یەکەم: گەواهی سرووش لەسەر واتای ئەم بەرپرسیارییەتییە

گەواهییەکان

١ـ لەڕاستیدا ئەو گەواهییەی کە زۆر دەموەستێنێت و خۆی بەتەنیا بەسە بۆئەوەی ببێت بە گەواهی لەسەر ئەم بابەتە، گەواهییەکی ڕاستەوخۆیە بە دیاریکراوی لەسەر زیندووکردنەوەی خود بەرپرسیارییەتی لەلای ئافرەت، ئەگەرچی لە هەمان گەواهییدا باسی پیاوانیش کراوە، بەڵام ڕاستەوخۆ ئافرەتی پێ دوێنراوە، کە ئەویش فەرموودەیەکی سەحیحە و لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە. ﴿وَأَنْذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾﴾ [الشعراء: ٢١٤] واتا: «ئەی پێغەمبەر، کەسوکارە نزیکەکانت بێدار بکەوە و بترسێنە.» کاتێک خودا ئەم ئایەتەی دابەزاند بۆ سەر پێغەمبەر (ﷺ) و ئەویش سەرکەوت بۆ سەر کێوی سەفا بۆئەوەی یەکەم پەیامی گشتی خۆی ڕابگەیەنێت؛ بانگی لە خەڵکی کرد و فەرمووی: «ئەی کۆمەڵی قورەیش ...!»[1] هەروەها وتی: «ئەی

---

(١) «أن أبا هريرة رضي الله عنه قال: قام رسول الله ﷺ حين أنزل الله عز وجل: { وأنذر عشيرتك الأقربين} قال: "يا معشر قريش - أو كلمة نحوها - اشتروا أنفسكم، لا أغني عنكم من الله شيئا، يا بني عبد مناف، لا أغني عنكم من الله شيئا، يا عباس بن عبد المطلب،

کوڕانی هۆزی عەدی ...» دواتر وتی: «ئەی سەفیە! کە پووری پێغەمبەر (ﷺ) بوو. لەلای خودا هیچم بۆت بەدەستەوە نییە، ئەی فاتیمەی کچی موحەممەد (ﷺ)، لە سامانی خۆم هەرچی داوا دەکەیت بیکە، بەڵام لەلای خودا هیچم بۆت بەدەستەوە نییە.» پێغەمبەر (ﷺ) لێرەدا ناوی دوو ئافرەتی هێنا، کە ڕوونە دواندنەکەش بۆ چاندنی بابەتی خود بەرپرسیارییەتی بوو، کە ڕزگاربوونت پەیوەستە بەخۆتەوە، ئەوەی کە پووری پێغەمبەری (ﷺ) یاخود کچی پێغەمبەری (ﷺ)، دادت نادات و من لەلای خودا هیچم بۆ ئێوە بەدەستەوە نییە، کە ئەمەش بابەتی بونیادنانی خود بەرپرسیارییەتی تێدا ڕوونە.

٢- خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَوْمَ يَفِرُّ الْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ ﴿٣٤﴾ وَأُمِّهِ وَأَبِيهِ ﴿٣٥﴾ وَصَاحِبَتِهِ وَبَنِيهِ ﴿٣٦﴾﴾ [عبس: ٣٤-٣٦] واتا: «ئەو ڕۆژەی برا لەدەست براکەی هەڵدێت، لەدەست دایک و باوکی، لەدەست هاوسەر و کوڕەکەی.» کە لێرەدا باسی پیاو و ئافرەتیشی تێدایە، کە چۆن هەموو مرۆڤێک لە ڕۆژی قیامەتتدا، ڕادەکەن لە یەکتری و هەر کەسێک و بەرپرسیارە لە خودی خۆی.

## بەرپرسیارییەتی یەکەم - بەشی دووەم: ئەرک و کارەکان کە لەژێر چەتری ئەم بەرپرسیارییەتییەوە درێژ دەبنەوە

سەرەڕای ئەرکە گشتییەکان جێبەجێکردنی فەرزەکان و دوورکەوتنەوە لە حەرامەکان کە ئیسلام هێناوییەتی، کۆمەڵێک ئەرک و کاری دیکەی پەیوەست بە ئافرەت لەدوای ئەرکە گشتییەکانەوە هاتوون، کە دەکرێت لەژێر

---

لا أغني عنك من الله شيئا، ويا صفية عمة رسول الله، لا أغني عنك من الله شيئا، ويا فاطمة بنت محمد، سليني ما شئت من مالي، لا أغني عنك من الله شيئا "» پێشەوا بوخاری گێڕاویەتییەوە بە ژمارە (٢٧٥٣)

چەتری خود بەرپرسیارییەتی درێژ بکرێتەوە، بۆیە دەڵێین پەیوەستە بە ئافرەت، چونکە کۆمەڵێک دەق هاتوون ڕاستەوخۆ ئافرەت دەدوێنن، یاخود بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ پەیوەندییەکی بە ئافرەتەوە هەیە. هەروەها ڕەنگە ئەم بەشە تاکە بەش بێت کە وردەکاری تێدایە دەربارەی ئەرکەکان و گەواهییەکان بە بەراورد بە بەش و بەرپرسیارییەتییەکانی دیکە. سەرەتا پێش ئەوەی ئەرکەکانی پەیوەست بە ئافرەت باس بکەم، کۆمەڵێک لە ئەرکە گشتییەکان کە پیاو و ئافرەت دەگرێتەوە باس دەکەم:

١ـ چاکسازی دڵ، پاڵفتەکردنی دەروون، کاری چاکە، دەستەبەرکردنی بەندایەتی، ملکەچی و خۆبەدەستەوەدان بۆ دەقە شەرعییەکان

ئەمە یەکێکە لەو ئەرکانەی کە گشتییە و گەواهی زۆریشی لەسەرە، بەڵام من لێرەدا ئەو ئایەتە گشتییانە دەهێنمەوە کە لە دواندنەکەدا، باسی ئافرەتی تێدایە و لە هەمان کاتیشدا ئەم واتایەی لەخۆ گرتووە.

گەواهی یەکەم: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَنْ يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَنْ يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا مُبِينًا ﴿٣٦﴾﴾ [الأحزاب: ٣٦]، واتا: «بۆ هیچ پیاوێکی باوەڕدار یان ژنێکی باوەڕدار، نییە کاتێک کە خودا و پێغەمبەرەکەی بڕیاری شتێک بدەن، ئەوان سەرپشک بن (لە ئەنجامدانی ئەو کارە، چونکە) ئەوەی سەرپێچی بکات لە فەرمانی خودا و پێغەمبەرەکەی، ئەوە ئیتر بە ئاشکرا گومڕا و سەرلێشێواوە.» ئەم ئایەتە دواندن و باسکردنی ڕاشکاو و ڕاستەوخۆی ئافرەتی تێدایە، لە ڕووی خۆبەدەستەوەدان و ستنەبوون بەرانبەر ئەو فەرمانانەی خودا کە چەسپاون و هیچ هەڵبژاردنێکی تری بۆ نییە.

گەواهی دووەم: ﴿إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ وَالْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَالْقَانِتِينَ وَالْقَانِتَاتِ وَالصَّادِقِينَ وَالصَّادِقَاتِ وَالصَّابِرِينَ وَالصَّابِرَاتِ وَالْخَاشِعِينَ وَالْخَاشِعَاتِ وَالْمُتَصَدِّقِينَ وَالْمُتَصَدِّقَاتِ وَالصَّائِمِينَ وَالصَّائِمَاتِ وَالْحَافِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَالْحَافِظَاتِ وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُمْ مَغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا﴾ [الأحزاب: ٣٥] واتا: «بەڕاستی پیاوان و ئافرەتانی موسڵمان، پیاوان و ئافرەتانی باوەڕدار، پیاوان و ئافرەتانی ملکەچ و فەرمانبەردار، پیاوان و ئافرەتانی ڕاستگۆ، پیاوان و ئافرەتانی خۆگر، پیاوان و ئافرەتانی لەخواترس، پیاوان و ئافرەتانی بەخشندە، پیاوان و ئافرەتانی ڕۆژووان، پیاوان و ئافرەتانی داوێن پاک و ئەو پیاو و ئافرەتانەی کە زۆر یادی خوا دەکەن، بەخشین و لێبووردەیی و پاداشتی زۆر مەزن و بێسنووریان لەلایەن خودای گەورەوە بۆ ئامادەکراوە (هەر کە دونیایان بەجێهێشت پێی شاد دەبن).»

ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر کۆششی هەر کەسێک لەپێناو پاڵفتەی دەروونی خۆی و هەستان بە کردنی کردەوەی چاکە.

٢ـ سەنگینی و پاکیزەیی و داوێن پارێزی

ئەمەشیان بەڕوونی گەواهی سرووشی لەسەرە، هەروەها کاتێک باس لە بەرپرسیارییەتی، یاخود ئەرک دەکەین، ئەوا باسمان لە چاکەیەک کردووە کە مرۆڤ ـ ئافرەت بەهۆیەوە لە خودا نزیک دەبێتەوە. هەروەکوو پێشتر وتم، دەبێت مرۆڤ وەها لەم بەرپرسیارییەتی و ئەرکانە بڕوانێت، کە هەلێکە؛ هەلێک بۆ کاری چاکە و نزیکبوونەوە لە خودا.

گەواهی یەکەم: ﴿وَمَرْيَمَ ابْنَتَ عِمْرَانَ الَّتِي أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهِ مِنْ رُوحِنَا وَصَدَّقَتْ بِكَلِمَاتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِ وَكَانَتْ مِنَ الْقَانِتِينَ ﴿١٢﴾﴾ [التحريم:

١٢]، واتا: «هەروەها نموونەی هێناوەتەوە بە مەریەمی کچی عیمرانیش کە داوێنی خۆی بە پاکی ڕاگرت، ئێمەش لەو ڕۆحەی کە بەدەستمانە، فوومان پێداکرد، ئەویش باوەڕی تەواوی هەبوو بە گوتار و فەرمانەکانی پەروەردگاری و هەمیشە و بەردەوام ملکەچ و فەرمانبەردار و خواناس و نزاکار بوو.»

گەواهی دووەم: ﴿وَقُلْ لِلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ﴾ [النور: ٣١] واتا: «بە ئافرەتانی باوەڕداریش بڵێ: چاویان بپارێزن (لە تەماشای نامەحرەم) داوێنی خۆیان بپارێزن لە گوناھ و جوانی خۆیان دەرنەخەن ...» بێگومان ئەم گەواهییانەش، بنیاتنانی بابەتی سەنگینی و پاکیزەیی و پاراستنی داوێنی تێدا ڕوونە.

٣ـ حیجاب و خۆداپۆشین

کە ئەمەیان پەیوەستە بە ئەرک و کاری دووەمەوە، بەڵام بەتەنیا باس دەکرێت لەبەر مەرکەزییەت و گرنگییەکەی لە شەرعدا، هەروەها حیجاب خواپەرستییەکە کە ئافرەت بەهۆیەوە خودا دەپەرستێت و لێی نزیک دەبێتەوە و هاوتایە لەگەڵ بنچینەی شەریعەت و مەبەستەکانی و هەروەها لەگەڵ سروشتی ئەو حوکمانەی کە هاتوون لەلایەنی پیاو و ئافرەتەوە.

گەواهی یەکەم: ﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ﴾ [النور: ٣١] واتا: «با سەرپۆشەکانیان بدەن بەسەر سینە و ملیاندا ...»

گەواهی دووەم: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لِأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلَابِيبِهِنَّ ۚ﴾ [الأحزاب: ٥٩] واتا: «ئەی پێغەمبەر بە هاوسەر و کچانت و ئافرەتانی باوەڕدار بڵێ با بە پۆشاکی داپۆشراو خۆیان داپۆشن ...»

٤ـ ئارامگرتن لەکاتی کارەساتەکاندا

ئەگەرچی ئەمە بابەتێکی هاوبەشە لەنێوان پیاو و ئافرەت، بەڵام لە ئاست ئافرەتدا زیاتر جەختی لێ کراوەتەوە، ئەوەی ڕابمێنێت لەو دەقانەی شەریعەت، کە ئافرەتی پێ دوێندراوە، هەست بەوە دەکات کە ئەم بابەتە لە ئافرەتدا زیاتر جەختی لێ کراوەتەوە.

گەواهی یەکەم: لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە، کە ئەبوو موسای ئەشعەری دەڵێت: «پێغەمبەری خودا (ﷺ) بێبەرییە لەو ئافرەتانەی کە لەکاتی کارەساتدا دەنگ بەرز دەکەنەوە، قژی خۆیان دەنڕن! جلی خۆیان دەدڕن!»[1]

گەواهی دووەم: لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە، کە ئەبوو مالیکی ئەشعەری دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: «أربع في أمتي من أمر الجاهلية لا يتركونهن: الفخر في الأحساب، والطعن في الأنساب، والاستسقاء بالنجوم، والنياحة.» واتا: «چوار شت هەیە لەناو ئوممەتەکەمدا کە لە کار و پیشەی سەردەمی نەفامیە و ئوممەتەکەم وازی لێ ناهێنن، یەکەمیان خۆهەڵکێشانە بە عەشیرەت و نەسەبەکەی بەسەر غەیری خۆیدا، دووەمیان قسەوتن و ڕەخنەگرتن لە ڕەچەڵەکی خەڵک، سێیەمیان دانە پاڵی بارانبارین بۆ لای ئەستێرەکان و باوەڕبوون بەوەی ئەستێرەکان باران دەبارێنن، یان هۆکاری بارانبارینن، چوارەمیان پیاهەڵدان و ڕۆڕۆکردن بۆ مردووان.» دواتر پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: «النائحة إذا لم تتب قبل موتها؛ تقام يوم القيامة وعليها سربال من قطران ودرع

---

(١) «عن أبو بردة بن أبي موسى رضي، الله عنه، قال : وجع أبو موسى وجعا فغشي عليه ورأسه في حجر امرأة من أهله، فلم يستطع أن يرد عليها شيئا، فلما أفاق قال: أنا بريء ممن برئ منه رسول الله ﷺ، إن رسول الله ﷺ برئ من الصالقة، والحالقة، والشاقة.» پێشەوا بوخاری گێڕاویەتییەوە بە ژمارە (١٢٩٦)

من جرب» [موسلیم: ٩٣٤] واتا: «ئەو کەسەی سەردولکە و لاوانەوە دەکات لەسەر مردوو، ئەگەر تەوبە نەکات پێش مردنی، لە ڕۆژی قیامەت کاتێک هەڵدەستێتەوە جلێکی لە جرب ـنەخۆشی بۆگەنی پێستیـ لەبەر دەکرێت، لەگەڵ کراسێک لە ڕۆنی تواوە ـبۆ ئەوەی جوان بسووتێت و بۆنی بۆگەن بێت.ـ» هەربۆیە ئارامگرتن لەکاتی کارەساتدا لە ئەرکە سەرەکییەکانی ئافرەتە ـوەکوو خود بەرپرسیارییەتیـ هەروەها هۆکارە بۆ سزای دوارۆژ ئەگەر بەدی نەهات و بەشێوەیەکی گشتیش بونیادنراوە لەسەر باوەڕ بە قەزا و قەدەر.

٥ـ پاراستنی زمان

ئەم ئەرکە ئەگەرچی گشتییە، بەڵام بە دیاریکراوی لە ئاست ئافرەتدا دەق هاتووە:

گەواهی یەکەم: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِنْ قَوْمٍ عَسَىٰ أَنْ يَكُونُوا خَيْرًا مِنْهُمْ وَلَا نِسَاءٌ مِنْ نِسَاءٍ عَسَىٰ أَنْ يَكُنَّ خَيْرًا مِنْهُنَّ﴾ [الحجرات: ١١]، واتا: «ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە با هیچ کەستان گاڵتە و سووکایەتی بە کەسی تر نەکات، ڕەنگە گاڵتەپێکراو باشتر بێت لە گاڵتەپێکەر. با هیچ ئافرەتێکیش گاڵتە و سووکایەتی بە ئافرەتانی تر نەکات، ڕەنگە ئافرەتی گاڵتە پێکراو باشتر بێت لە گاڵتەپێکەر ...»

گەواهی دووەم: پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەفەرمووێت: «يا معشر النساء، تصدقن ؛ فإني أريتكن أكثر أهل النار.» واتا: «ببەخشن چونکە من ئێوەی ئافرەتم بینی زۆرینەی دۆزەخ بوون!»، ئافرەتەکان وتیان: بۆچی ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ)؟ فەرمووی: «تكثرن اللعن، وتكفرن العشير» [بوخاری: ٣٠٤] واتا: «زۆر جنێودان و قسەوتن، پێنەزانین و نکۆڵیکردنە لە چاکەی مێرد.» ئەم زۆر

جنێودان و قسەوتنەش ئەگەر لە پیاویشدا ڕوویدا هەر هەمان شتە ... هەربۆیە پاراستنی زمان بەتایبەت لە گاڵتەکردن و جنێودان لەو ئەرکانەیە کە دەبێت ئافرەت زیاتر گرنگی پێ بدات، واقعەکەش گەواهی ئەوە دەدات کە ئەم بابەتە بژێوییەکی ڕازاوەی زۆربەی دانیشتنگەکانی ئافرەتە. هەربۆیە ئافرەتی موسڵمان دەبێت ئاگاداری ئەم واتایە ببێت.

٦. بەخشین

ئەمەش لەو کارانەیە کە گشتییە، بەڵام لەڕێگەی دەقەوە بەتایبەتی ئافرەتی پێ دوێنراوە، هەروەکوو پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: «ئەی کۆمەڵی ئافرەت! ببەخشن چونکە من ئێوەی ئافرەتم بینی زۆرینەی دۆزەخ بوون!» ئەم بەخشینە لە گەورەترین ئامرازەکانی پاراستنە لە ئاگر بەگشتی و بۆ ئافرەتانیش بە دواندنێکی تایبەت.

٧. ڕەچاوکردنی ڕێسای ئیسلامی لەکاتی خۆجوانکردندا

خودای گەورە سەنای ئافرەتی کردووە کە ﴿أَوَمَنْ يُنَشَّأُ فِي الْحِلْيَةِ﴾ [الزخرف: ١٨]، هەروەها لە بابەتی جوانکاری شەریعەت شتانێکی بۆ ئافرەت ڕێگە پێ داوە کە بۆ پیاو ڕێگری کردووە، کە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی ئافرەت، شەریعەت ڕەچاوی ئەم بارودۆخە و خۆشەویستییە بۆ خۆجوانکردنی لە ئافرەت کردووە. بەڵام هەندێک یاسا و ڕێسای لەسەر هاتووە و هەروەها هەندێک لە دەقەکان توندی تێدا بەکار هێنراوە، بەتایبەتی لەو بابەتانەی کە زیادەڕەوی و گەوجاندنی تێدایە لە بابەتی جوانکاری، وەکوو: برۆکردن کە نەفرینی لەسەرە! هەروەها تاتۆکردن.

٨. زانست و تێگەیشتن لە ئایین

تەنیا لە ڕووی خود بەرپرسیارییەتییەوە، بەبێ ڕوانین لەوەی فێربوونی زانست مەبەستی ئەو پەیامەیە کە پێمان گەیشتووە، چ فێرکردنی خەڵکی بێت، یاخود بانگەواز بۆ لای خودا ... ئەمە یەکێک بووە لەو کارە لە پێشینەییانەی کە ئافرەتان لە کۆمەڵگەی پێغەمبەریدا (ﷺ)، جێبەجێیان کردووە.

گەواهی یەکەم: ﴿وَاذْكُرْنَ مَا يُتْلَىٰ فِي بُيُوتِكُنَّ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ وَالْحِكْمَةِ ۚ إِنَّ اللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا ﴿٣٤﴾﴾ [الأحزاب: ٣٤]، واتا: «هەرچی لە ماڵەکانتاندا دەخوێنرێتەوە لە قورئان و فەرمووده یادی بگرن و فەرامۆشی مەکەن و باسی بکەن بۆ خەڵکی، بەڕاستی خوا هەمیشە و بەردەوام بە لوتف و وردبین و بە ئاگایە (لە هەڵسوکەوتی بەندەکانی).» هەندێک لە زانایان دەڵێن واتاکەی: «پەیبردنە بە نیعمەت» هەندێکی دیکەش دەڵێن: «مەبەست پێی فێربوونی قورئان و بیرکردنەوە و تێڕامانە لێی.» هەروەها لەم سیاقەدا مەبەست پێی ئەوەیە کە ئافرەت پێویستە لەسەری کە فێر ببێت نەک لە ڕووی مافەوە بەڵکوو لە ڕووی ئەوەی کە پێویستە لەسەری کە فێر ببێت، خود بەرپرسیارییەتی هەبێت، بەتایبەت ئەوەی کە پەیوەندی بە حوکمە فقهییەکانی خۆی و نزیکبوونەوە لە خوداوە هەیە.

٩ـ دامەزراوەیی لەبەرانبەر بەڵاکان

کە ئەمەش بەرپرسیارییەتییەکە هەموو تاکێک دەگرێتەوە، بەڵام هەندێک جار لە ئاست ئافرەتدا زیاتر جەختی لێ دەکرێتەوە. مەبەست لە بەڵا لێرەدا: بەڵای ئارەزوو و گومانەکان و هەروەها بەڵای زاڵبوون و ستەمکاری.

گەواهی یەکەم: وەکوو ئەوەی کە هاتووە، زۆربەی ئەوانەی شوێن دەجال

دەکەون ئافرەتانن! بەڵای دەججالیش بە واتای سەرەکی دەچێتە چوارچێوەی گومانەکانەوە.

گەواهی دووەم: ئافرەتانی قۆناغی مەککی، ئەو هەڵوێستانەی دەیاننواند لەپێناو ئیسلامدا، ئاخر ئەگەر سەنا نەکرێت بە دامەزراوەیی لەبەرانبەر ئاڵنگارییەکان کە بوونی هەبوو، بە جۆرێک ئاڵنگارییەکانیش زۆربەیان زاڵ بوون و ستەمکاری بوون بۆ ماوەیەکی دووروودرێژ، ئیتر بە چی سەنا بکرێت، هەروەها کۆچکردنیان بۆ حەبەشەش گەواهییە لەسەر ئەم واتایە.

## بەرپرسیارییەتی یەکەم - بەشی سێیەم: گەواهییەکان لەسەر ئەوانەی هەستاون بە جێبەجێکردنی خود بەرپرسیارییەتی لە ژیانیاندا

گەواهی یەکەم: لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە، کە «ئەبی سەعید» دەیگێڕێتەوە: «ئافرەتان زۆرترین کەسانێک بوون، کە ماڵیان دەبەخشی.»[١]

گەواهی دووەم: دەربارەی پاراستنی زمانە، وەکوو ئەوەی گێڕدراوەتەوە کە لەسەر دایکە زەینەب هاتووە لەکاتی ڕووداوی ئیفک ئەو ڕووداوەی کە بوختان بۆ دایکە عائیشە کرا. دا. هەروەک دەزانرێت کە دایکە زەینەب کێبڕکێکاری دایکە عائیشە بوو لەلای پێغەمبەر (ﷺ)، هەروەها بە ئیعتیباری ئافرەتانە ئەمە گەورەترین هەلە کە بێتەدی بۆ خستنی کێبڕکێکارەکەت، بەڵام کاتێک پێغەمبەر (ﷺ) لە دایکە زەینەبی پرسی دەربارەی ئەو ڕووداوە، وتی: «ئەی پێغەمبەری خودا! (ﷺ) گوێ و چاوم دەپارێزم و چاکە نەبێت هیچی تری

---

(١) پێشەوا موسلیم گێڕاویەتییەوە بە ژمارە (٨٨٩)

لەبارەوە -عائیشە- نازانم.»[1] کە ئەمەش دەستەبەرکردنی لە خواترسانێکی مەزنە و هەروەها پەیبردنە بە خود بەرپرسیارییەتی، ترسانی لە خودا ڕێگری لێ کرد لەوەی شتێک بڵێت، ئەگەرچی بەرژوەندییەکی گەورەی خۆیشی تێدا بوو.

گەواهی سێیەم: کە دەربارەی بابەتی زانستە، گەواهییەکەش فاتیمەی کچی موحەممەدی سەمەرقەندییە، باوکی لە زانا گەورەکانی حەنەفییە لە تورکستان و خاوەنی پەرتووکی (تحفة الفقهاء) ئەم ئافرەتە پەرتووکەکەی باوکی (تحفة الفقهاء) لەبەر کرد، کە پەرتووکێکی گەورە و قورسە، هەروەها ئاستی زانستێکی بەرادەیەکی زۆر پێشکەوت تاوەکوو لە ژیاننامەی خۆی و باوکیدا باس بکرێت کە فەتوا بە واژۆی دوو کەس دەردەچێت؛ واژۆیی باوکی و واژۆی خۆی لەبەر فراوانی ئەو زانست و تێگەیشتنەی کە هەیبوو.هەروەها لە سەردەمی «نورەدین زەنگی»دا ژیاوە، باس دەکرێت کە ئەم پاشایە لە هەندێک بابەتدا ڕاوێژی پێ کردووە، جگە لەوانەش گەشتووە بە سەلاحەدینی ئەیووبی.

باس دەکرێت کە داوای خوازبێنی لەلایەن خزمی خۆیەوە لێ کراوە، بەڵام شووی نەکردووە ئیللا بە «کاسانی» نەبێت، کە ئەویش لە زانا گەورەکانی حەنەفییە و خاوەنی پەرتووکی (بدائع الصنائع)، هەروەها «کاسانی» پەرتووکی (تحفة الفقهاء)ی باوکی ئەم ئافرەتەی ڕاڤە کردووە، بۆیە دەڵێن: «ڕاڤەی پەرتووکەکەی کرد بۆیە کچەکەی خۆی پێ دا.» هەروەها باسی ئەوەش دەکرێت کە «کاسانی» مێردی لە هەندێک بابەت تێ دەگەیاند و هەندێک لە فەتواکانی بۆ ڕاست دەکردەوە.

---

(١) پێشەوا بوخاری گێڕاویەتییەوە بە ژمارە (٢٦٦١)

ئەم گەواهییە ئەوەمان پێ دەڵێت کە ئافرەت دەتوانێت شەرعزان بێت، یاخود بەلای کەمەوە ببێت بە مەرجەعێکی زانستی تۆکمە لەو بابەتانەی کە پێویستی پێیەتی.

خود بەرپرسیارییەتی بەشی چوارەم: پێشنیاری کردەیی بۆ هەستان بەم بەرپرسیارییەتییە لە واقعی ئەمڕۆماندا

هەندێک بابەت هەن، ڕوونن پێویست بە پێشنیاری ناکات، بەڵام، سەرەکیترین و گەورەترین بابەت لە واقعی ئەمڕۆدا و دەربارەی خود بەرپرسیارییەتی ئافرەت؛ زیندووکردنەوەی بنەمای خود بەرپرسیارییەتی لەلای ئافرەت، بۆیە تاوەکوو لەژێر هەستی بەرپرسیارییەتی ئەم هەموو ئەرکانە لەسەر ئافرەت پێویست بکەیت، پێویستت بە زیندووکردنەوەی ڕۆحی خواپەرستی هەیە لەگەڵ هەڵگیرساندنی نوورێکی ئیمانی کە خاوەنەکەی بجووڵێنێت.

بێگومان لەم سەردەمەی ئێستا و لەژێر سێبەری ئەم واقعەدا، کە لاوازی هەستکردن، بەرپرسیارییەتی تێیدا گەشتووەتەوە ترۆپک، دەبێت بایەخێکی زۆر گەورە بەم پێشنیارە بدرێت. لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) هەستکردن بەرپرسیارییەتی بوو کە وای لە ئوم کەلسومی کچی ئەبی مەحیت کرد؛ کچی ئەو پیاوەی کە پاشماوەی گیانداری کردە سەر سەری پێغەمبەر (ﷺ) لەکاتێکدا لە سوجدەدا بوو لەلای کەعبە، هەروەها یەکێک بوو لە هاوبەشدانەرە خراپەکانی قورەیش، بەڵێ ئەو بەرپرسیارییەتییە بوو وای لە کچەکەی ئوم کەلسوم کرد کە یەکەم: لە ماڵی تاغوتێکدا موسڵمان ببێت، دووەم: لەدوای ڕێکەوتنی حوودەیبییە، بە تەنیا لە مەککەوە کۆچ بکات بۆ مەدینە. کە دواتر براکەی ڕۆیشت بە دوایدا و داوای لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد بیگەڕێنێتەوە،

بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) نەیگەڕاندەوە، چونکە وتەی خودا دابەزیبوو کە نابێت ئافرەتانی باوەڕدار بگەڕێندرێنەوە.

پێشنیارێکی دیکە: بەهێزکردنی بەرگری ئافرەت لەبەرانبەر بەڵای گومانەکان بەشێوەیەکی تایبەت و بەڵای ئارەزووەکانیش بەشێوەیەکی گشتی. لەم سەردەمەدا ئافرەت بە زۆر جۆری گومان دەورە دراوە، لەو گومانانەش، فیمینیزم، هەر بەو بۆنەیەوە: زۆربەی ئەو ئافرەتانەی کە بە گومانەکانی فیمینیزم کاریگەر دەبن، بەشێکی گەورەی هۆکاری کاریگەربوونەکە ئەوەیە ئامێری بیرکردنەوەی ناوەکی و پێوەرەکانی ئافرەتەکە کەم و لاوازن! هەروەها وریاکەرەوەیەکی باڵای نییە کە لە پووچی و بچووکی ئەم لایەنانە وریای بکاتەوە، هەربۆیە هەر لایەنێک دەستکەوتی گەورەتری بۆ بەدەست بهێنێت، ئەوا دەکرێت پێی کاریگەر ببێت. کەواتە گەورەترین هۆکاری پارێزەر لەم گومانانە بەتەنیا وەڵامدانەوەی کێشە و گومانەکان نییە، بەڵکوو دەرهێنانی ئافرەتە لەم زۆنگاوەدا، بەرزکردنەوەی پێوەرەکانی و زیندووکردنەوەی بنەمای بەرپرسیارییەتییە لەلای، هەروەها کشان و تێپەڕاندنی بیرکردنەوەکانی لە ئاسۆیەکی ماددییەوە بۆ ئاسۆی دواڕۆژ، بێگومان بوونی ئەو کێشانەی کە لە واقعیەکەدا هەیە وەکوو ستەم و ... تاد. لەو هۆکارانەن کە دەبنە هۆی دروستبوون و کاریگەربوون بەم گومانانە، ئەگەرچی ئەم کێشانە بیانوو نین، بەڵکوو بزوێنەرن بۆ ئەم گومانانە و پێویستە چارەسەر بکرێن.

## بەرپرسیارییەتی دووەم: بەرپرسیارییەتی خێزانی

بەرپرسیارییەتی دووەم - بەشی یەکەم: گەواهییەکانی سرووش لەسەر بنچینەی ئەم بەرپرسیارییەتییە:

گەواهی یەکەم: فەرموودەیەکی سەحیحی «ئیبن عومەر»ە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ)، کە دەفەرمووێت: «والمرأة راعية على بيت زوجها وولده» [بوخاری: ٥٢٠٠] واتا: «ئافرەت لە ماڵی مێردەکەی و منداڵەکانیدا، بەرپرسیار و چاودێرە بەسەریانەوە.» «خەتابی» لەسەر ئەم فەرموودەیە دەڵێت: «چاودێر لەم فەرموودەیەدا کەسێکی پارێزەر و دڵنیایە لەسەر ئەوەی کە لەژێر دەستی دایە.»

«نەوەوەی»یش دەڵێت: «هەروەها ئەم فەرموودەیە ئەوەی لێ وەردەگیرێت کە هەرچی لەژێر چاودێری ئەودا ئافرەت بوو، داوا لێکراوە بە دادگەری مامەڵە بکات تێیدا و بە کارێک هەستێت کە لە بەرژوەندی ئایین و دونیا و ئەوانەشی پەیوەستن پێەوە هەبێت.»

گەواهی دووەم: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنْفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا﴾ [التحريم: ٦] واتا: «ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، خۆتان وماڵومناڵتان لە ئاگر بپارێزن ...»

گەواهی سێیەم: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: «كل مولود يولد على الفطرة، فأبواه يهودانه أو ينصرانه أو يمجسانه» [بوخاری ١٣٨٥] واتا: «هەموو منداڵێک لەسەر فیترەت لەدایک دەبێت، ئیتر ئەوە باوک و دایکین کە دەیکەن بە جوولەکە، یاخود مەجووسی.»

بەرپرسیارییەتی دووەم - بەشی دووەم: ئەرک و کارەکان کە لەژێر چەتری ئەم بەرپرسیارییەتییەدا درێژ دەبنەوە:

١- پەروەردەکردنی منداڵ

گەواهی یەکەم: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: «والمرأة راعية على بيت زوجها وولده» [بوخاری: ٥٢٠٠] واتا: «ئافرەت لە ماڵی مێردەکەی و منداڵەکانیدا، بەرپرسیار و چاودێرە لەسەریان.»

گەواهی دووەم: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: «خير نساء ركبن الإبل صالح نساء قريش؛ أحناه على ولد في صغره، وأرعاه على زوج في ذات يده» [بوخاری: ٥٠٨٢] واتا: «چاکترین ئافرەتانێک کە سواری حوشتر بووبن، ئافرەتانی قورەیشن، کە زۆر بە بەزەیی و نەرمن لەگەڵ منداڵیان و هەروەها زۆر چاودێری و پارێزگاری دەکەن لە ماڵ و سامانی مێردەکانیان.» ئەم فەرموودەیەش ئەوەمان پێ دەڵێت کە هۆی چاکترینبوونیان دوو شتە:

١- زۆر بە بەزەیی و نەرمن لەسەر منداڵەکانیان، کە ئەمەش ئاماژەیەکی ڕوونی تێدایە لەسەر ئەو چاودێریکردن و بەزەیی و نەرمی نواندنەی کە دەبەخشرێت بە منداڵ لەلایەن دایکەوە.

٢- چاودێر و پارێزەری ماڵ و سامانی مێردەکەیەتی.

گەواهی سێیەم: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: «مروا أولادكم بالصلاة وهم أبناء سبع سنين، واضربوهم عليها وهم أبناء عشر، وفرقوا بينهم في المضاجع» [سەحیح سونەن ئەبو داود: ٤٩٥] واتا: «منداڵەکانتان لە تەمەنی حەوتساڵیدا هان بدەن بۆ نوێژکردن، لە تەمەنی دە ساڵیدا لێیان بدەن ئەگەر نوێژیان نەکرد.»

٢ـ پاراستنی مافی مێرد و گوێڕایەلیکردن و سپڵەنەبوونیان بەرانبەر ئەو شتانەی بۆی کردووی

گەواهی یەکەم: پێغەمبەری خودا (ﷺ) نکۆڵیکردن و سپڵەبوون بەرانبەر مێردی بە یەکێک لە هۆکارەکانی چوونە دۆزەخ داناوە بە نیسبەت ئافرەتەوە، کە ئەوەشی بەم فەرموودەیەی ڕوون کردەوە: «لو أحسنت إلى إحداهن الدهر، ثم رأت منك شيئا قالت: ما رأيت منك خيرا قط.» [بوخاری: ٢٩] «ئەگەر بۆ هەمیشە چاکەت هەبێت بۆ یەکێکیان -ئافرەت- بەڵام دواتر شتێک (هەڵە)ی لێت بینی، -ئافرەتەکە- دەڵێت: هەرگیز هیچ شتێک (چاکەیەک)م لەتۆ نەبینیوە.»

گەواهی دووەم: ئەو شتانەی پەیوەندی هەیە بە لایەنی ژن و مێردایەتییەوە سەرجێیی. کە نەفرینی فریشتەکانی لەسەر هاتووە بۆ ئافرەتێک کە مێردەکەی لەیاد بکات.

گەواهی سێیەم: هەروەها بابەتی پاراستنی سامان و کارڕاییکردنی، کە ئەم فەرموودەیەش ئاماژەی ئەوەی تێدایە: «خير نساء ركبن الإبل صالح نساء قريش؛ أحناه على ولد في صغره، وأرعاه على زوج في ذات يده» [بوخاری: ٥٠٨٢] واتا: «چاکترین ئافرەتانێک کە سواری حوشتر بووبن، ئافرەتانی قوڕەیشن، کە زۆر بە بەزیی و نەرمن لەگەڵ منداڵیان و هەروەها زۆر چاودێری و پارێزگاری دەکەن لە ماڵ و سامانی مێردەکانیان.»

## بەرپرسیارییەتی دووەم - بەشی سێیەم: گەواهی و نموونەی ئەو ئافرەتانەی کە هەستاون بەم بەرپرسیارییەتییە لە ژیانیاندا:

گەواهی یەکەم: ئەنەسی کوڕی مالیک و دایکی ئوم سولەیم «ئوم

سولەیم» ڕۆڵێکی سەرەکی هەبوو لە چالاککردنی ڕۆڵی ئەنەسی کوڕی مالیک لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ). دایکی پشتیوانیکاری بوو پشتیوانیکارێکی سەرەکی بۆئەوەی کوڕەکەی لە خزمەتی پێغەمبەردا (ﷺ) بێت، کە بۆماوەی دە ساڵان خزمەتی کرد، هەربۆیە ئەنەس ئەگەرچی بچووک بوو، بەڵام لەو کەسانەیە کە زۆر فەرموودەی گێڕاوەتەوە. هەروەها دایکی کە هات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ)، پێی وت: «ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) داوایەکم هەیە، ئەنەسی خزمەتکارت بۆی بپاڕێرەوە لەلای خودا.»[١] پێغەمبەریش (ﷺ) بۆی پاڕایەوە کە سامان و منداڵی زۆر ببێت.

گەواهی دووەم: گەواهییەکی شیرین و جوانە بە دیاریکراوی لە بابەتی ئافرەت و مێردایەتیدا، کە ئەوانیش «ئوم دەردا» و «ئەبوو دەردا»ن. «ئەبوو دەردا» لە هاوەڵە چاکەکانی پێغەمبەر (ﷺ) و خواپەرستەکانی بوو، زۆرترین فەرموودە کە لێیەوە گێڕدرابێتەوە لەلایەن خێزانەکەیەوە «ئوم دەردا» بووە، لە هەندێک لەو فەرموودانەی کە «ئوم دەرڕدا» کە دەیگێڕایەوە، نەیدەوت: «ئەبوو دەرڕدا بۆی گێڕامەوە.» بەڵکوو وەکوو خۆشەویستییەک بۆی دەیوت: «سەردارەکەم بۆی گێڕامەوە.» هەروەها بەسەرهاتێکی شیرین و جوانیان هەیە کە «ئوم دەرڕدا» بە «ئەبوو دەرڕدا»ی وت: «تۆ منت لە خێزانەکەم داوا کرد بۆ دونیا، بەڵام من دەمەوێت داوای تۆ بکەم بۆ بەهەشت! بۆیە دوای من ژن مەهێنە!»[٢] بەگشتی ئەو بارودۆخانەی کە لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) ڕوویانداوە لە بابەتی خێزانی، بەو شێوەیە نەبووە کە ئێمە بەشێوەی ئەمڕۆ. ناوی بنێین کێشە کۆمەڵایەتییە مەزن و گەورەکان لە پەیوەندی نێوان ژن و مێرددا.

---

(١) پێشەوا بوخاری گێراویەتییەوە بە ژمارە (٦٣٤٤)

(٢) حلية الأولياء (١/ ٢٢٤ - ٢٢٥)

ئەمرۆ ئێمە کێشەی تەڵاق و کۆمەڵایەتیمان زۆر زۆرە، لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) هەندێک ئاڵنگاری کۆمەڵایەتی بوونی هەبوو، هەندێک مەواقیف هەن، بەڵام کاتێک خوێندنەوە بۆ ژیاننامەی پێغەمبەر (ﷺ) دەکەیت، دەبینیت بارودۆخی سەرەکی و بنچینە، بارودۆخێکی ڕێکخراو و هێمن و پێکەوەژیانی چاک هەبوو.

## بەرپرسیارییەتی دووەم - بەشی چوارەم: پێشنیاری کردەیی بۆ هەستان بەم بەرپرسیارییەتییە لە واقعی ئەمڕۆماندا

پێم وایە گەورەترین شت کە پێشکەش بکرێت لە ئەمڕۆدا: دروستکردنی ئافرەتێکی موسڵمانی چاکەکارە، کە توانای ئەوەی هەبێت منداڵەکانی پەروەردە بکات، بە واتای پەروەردە.

لە سەختترین شتەکان کە ڕووبەڕووی ئافرەتان هەروەها پیاوانیش دەبێتەوە؛ پێگەشتنی نەوەیەکە کە زۆربەیان داننانێن بە ڕەفتار و بەهاکان، ئەسڵەن بەرپرسیارییەتی هیچ شتێک هەڵناگرێت، هەروەها هەندێکیان ئەگەرچی نێریش بن، ڕەنگە بگاتە ٢٥ ساڵ مۆمێکی بدرێتە دەست بتوێتەوە، هیچ بەرپرسیارییەتی و شتێکی نییە لە ژیاندا. بۆیە ئەگەر دایکیش هیچ شتێکی پێ نەبێت، ئەوا پێویستیَ بە توانای زیاتر هەیە بۆ خۆپێگەیاندن و پاشان پەروەردەی منداڵ، بە بەراورد بە سەردەمەکانی پێشوو، بەڵام هەندێک جار: (دایکان توانایەکی خەیاڵاوییان هەیە.) بۆ نموونە بڕوانامەیەکی زانستی، ماجیستێری بەدەستهێناوە ... ئەزیزم مەبەست لە بە توانایی ئەمە نییە.

هەربۆیە بەگشتی لە گەورەترین بابەت و پرۆژەکان کە دەکرێت پێشکەش

بکرێت لە ڕووی بەرپرسیارییەتی خێزانییەوە: پرۆژەی زیندووکردنەوەی ئەو شتانەی کە پێویستن، یاخود دروستکردنی ئافرەتێکە کە توانای پێگەیاندنی منداڵەکانی هەبێت، هەر هیچ نەبێت بەلای کەمەوە توانای ئەوەی هەبێت کێشە و ئاڵنگارییە تازەکان تێ بپەڕێنێت بەبێ دۆڕاندنی زیاتر.

هەروەها لە پێشنیارە زانستییەکانی ئەم ناونیشانە (دروستکردنی ئافرەتێکی موسڵمانی چاکەکارە) بە دیاریکراوی: کردنەوەی خول و پەیڕەوێکی خێزانییە لەژێر سەرپەرشتی دایکدا، بۆ جێبەجێکردن ئاسانە، ئەم بەرنامەیە پێویست نییە کە بەرنامەیەکی زانستی ورد بێت، دەکرێت هەر خولێکی پەروەردەیی بێت، تاوەکوو ئەگەر زۆریش بڵاو نەبوویەوە لەلای هەمووان، بەڵام هەزارەها دایک سوودی لێ وەربگرن، هەروەها بتوانێت چالاکی بکات و گەشەی پێ بدات لە کاتی جێبەجێکردنی کردەییدا.

پێشنیاری دووەم: کە لە ڕووی لایەنی فکرییەوەیە، چۆن دایک منداڵەکانی بپارێزێت لە گومان و کێشە فکرییەکان، هەروەها چۆن پارێزەری فکریان تێدا بچێنێت بە دیاریکراوی لەبەرانبەر ئەو گومانانەی کە بوونیان هەیە، ئێمە ئەمڕۆ لەبەرانبەر کێشەیەکی گەورە داین، بەڵام بابەتی هەقیقی ئەوەیە ئەم بەرپرسیارییەتییە بەشێکە لە خود بەرپرسیارییەتی، هەروەها بەشێکە لە بەرپرسیارییەتی گشتی بەرانبەر بە ئیسلام، بەڵام دەبینیت کە ئەو کاریگەرییە دەرەکییەکان کە لە دەرەوی خێزانن و پێشتر کاریگەری چاکیان هەبوو، ئەمڕۆ کاریگەرییان زۆر کەمترە لە چاو ڕابردوو، بۆ نموونە: مزگەوت: پێشتر هەندێک شتی پێشکەش دەکرد کە بەشدار بوو لە پڕکردنەوەی هەندێک لایەنی پێویستی منداڵەکان، خێوەتگە پەروەردەییەکان پێشتر بەربڵاو بوون بەشێوەیەکی گەورە، بەڵام ئێستا کەمیان کردووە، هەربۆیە ئێستا بابەتەکە لە

چوارچێوەی ماڵدا سنووردار بووە، ماڵ بتەوێت، یاخود نەتەوێت بووە بە خشتی سەرەکی لە ئوممەتدا، بەلای کەمەوە دەبێت منداڵ کەم تا زۆر بە تۆوی بەرگری و هەڵگرتنی بەرپرسیارییەتی لێی دەربچێت.

هەربۆیە مەترسە لەوەی ڕۆڵت هەبێت لەگەڵ منداڵەکان، یاخود ئەگەر خوشکێکیت لەگەڵ براکانت؛ لە بابەتی پارێزگاری فکر و هەروەها بونیادنانیان لەسەر خۆشەویستی ئیسلام و خودا و پێغەمبەر (ﷺ).

هەروەها لە گەورەترین ئەو شتانەی کە دەکرێت ئافرەت بە منداڵەکانی ببەخشێت چەسپاندنی خود بەرپرسیارییەتییە، لەبەرئەوەی تۆ ئەی دایک ناتوانیت ئەمڕۆ زاڵ بیت بەسەر منداڵەکەتدا، وا مەزانە کە دەتوانیت ڕێگری لێ بکەیت، مەڵێ: «منداڵەکەم خۆشەویستە و گوێ بۆ قسەکانم دەگرێت ...» زۆربەی ئەوان کاتێک گەورە دەبن، گوێت بۆ ناگرن، هەروەها دەتوانێت فیڵت لێ بکات، موبایلی پێیە و دەتوانێت بچێتە نێو هەرشتێکەوە کە دەیەوێت، بۆیە ناتوانیت ڕێگری لێ بکەیت، دەردەچێت لە ماڵ و دەڕوات بۆ قوتابخانە کە چاکە و خراپەی تێدایە، هەربۆیە گرنگترین شت تێیدا بچەسپێنیت: خود بەرپرسیارییەتییە.

هەندێک لەم واتایە تێنەگەیشتوون، دادەنیشێت و دەگری لەبەر ئەوەی منداڵەکەی کاریگەر بووە بەو فکر و ئاڵنگارییانە، تۆ ناتوانیت ڕێگری لێ بکەیت، ئەم بەلانەی کە بەربڵاوان، زۆربەی منداڵەکان پێی کاریگەر بوونە، جگە لەمانەش، گەورەترین کێشە ئەوەیە هەر لە ڕابردووەوە بەتەواوی پشتی بەتۆ بەستبێت، نەزانێت کە چۆن بیر بکاتەوە، مەگەر تۆ پێی بڵێیت کە چۆن! کاتێک بپژمێت نازانێت دەستەسڕ بەکار بێنێت مەگەر تۆ پێی بدەیت ...!

خود بەرپرسیارییەتی پێ ببەخشە، نەک لە شتەکانی پەیوەست بە ژیانی، بەڵکوو بەتایبەت ئەوەی پەیوەستە بەوەی کە تۆ مرۆڤێکی داوالێکراوی، من ئەگەرچی دایکت بم بەڵام ڕۆژی دوایی بەتەنیا دێیت، تۆ لێرەدا بوونت هەیە بۆ مەبەستێک و حیکمەتێک ... تاد.

## بەرپرسیارییەتی سێیەم: بەرپرسیارییەتی گشتی

بەرپرسیارییەتی سێیەم - بەشی یەکەم: گەواهییەکانی سرووش لەسەر ئەم بەرپرسیارییەتییە:

گەواهی یەکەم: بەڵگەی ڕاستەوخۆ و ڕاشکاو، ئەو ئایەتەیە کە لە سوورەتی تەوبەدا هاتووە: ﴿وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ﴾ [التوبة:٧١] ئەمە ڕوونە کە لە ڕۆڵەکانی ئافرەتی باوەڕدار لە ژیانیدا؛ فەرمانکردنە بە چاکە و ڕێگریکردنە لە خراپە، بۆیە هەر کەسێک بوێری ئەوە بکات و بڵێت ئەمە ناکرێت هیچ شێوازێکی هەبێت مەگەر لەناو ماڵەکەی خۆیدا نەبێت، ئەوە بوێری کردووە لە شتێکدا کە زانستی دەربارەی نییە، ئەم بەڵگەیە گشتییە بۆ هەموو شوێنێک، ناو ماڵەوەی بێت، یاخود دەرەوەی ماڵ.

گەواهی دووەم: ﴿كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ﴾ [ال عمران١١٠] واتا: «لەناو هەموو گەلاندا، ئێوە باشترینن، فرمان بە چاکە دەکەن و ڕێگری لە خراپە دەکەن و باوەڕ بە خودا دەهێنن.»

## بەرپرسیارییەتی سێیەم - بەشی دووەم: ئەرک و کارەکان کە لەژێر چەتری ئەم بەرپرسیارییەتییەدا درێژ دەبنەوە

### ١ـ بانگەواز بۆ لای خودا

کە دەکرێت وەسفی «کار» تێبپەڕێنێت بۆ وەسفی «بەرنامەی ژیان»، چونکە کار شتێکی کاتییە، هەربۆیە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێ کراوە کە بڵێت: ﴿قُلْ هَٰذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللَّهِ ۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا وَمَنِ اتَّبَعَنِي ۖ وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٨﴾﴾ [يوسف:١٠٨] واتا: «(ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تۆ ) بڵێ: ئا ئەمە ڕێگە و ڕێبازمە، من و شوێنکەوتووانم بانگ دەکەین بۆ لای خودای پەروەردگار لەسەر بنچینە و بناغەیەکی ڕوون و ئاشکرا، پاکی و بێگەردیش بۆ زاتی پەروەردگارە، من هیچ کاتێک لە موشریک و هاوەڵگەران نیم.» دەڵێت: «هەر کەس شوێنم بکەوێت.» بێگومان و بەبێ شک ئافرەتیش دەگرێتەوە، ﴿وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٨﴾﴾ [يوسف ١٠٨]. ئەمە ئایەتێکە بەڵگەیە لەسەر بەرنامەی ژیان، هەربۆیە بانگەواز بۆ لای خودا بە لای ئافرەتەوە ـوەکوو ئەوەیە کە بە لای پیاوەوەیە. دەکرێت ببێت بە بەرنامەی ژیان.

### ٢ـ ڕێگریکردن لە خراپە و شەڕکردن لەگەڵ فەساد و بەدڕەوشتی

کە ئەمەش فەسادی گشتی و تایبەتی و هەروەها خراپەی گشتی و تایبەتیش دەگرێتەوە، کە مەبەستم لە «تایبەت» ئەوەیە لە چوارچێوەی خێزاندا دەخوولێتەوە، بەڵام «گشتی» مەبەست لێی ئەوانەیە کە لە چوارچێوەی کۆمەڵگەی ئیسلامی دەخوولێتەوە: ﴿وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ﴾ [التوبة:٧١] واتا: «باوەڕدارانی

پیاو و ئافرەت، هەندێکیان خۆشەویست و پشتیوانی یەکترن و فرمان بە چاکە دەکەن و ڕێگری لە خراپە دەکەن.» سا چ ئیتر ئەو خراپەیە لەنێو ماڵدا بێت، یاخود ڕاگەیاندن و تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان ... هەر شتێکی تری تایبەت، یاخود گشتی ئەم پەیامە دەیگرێتەوە و پێویستە لەسەری کە ئەم ئەرکە هەڵبگرێت لە چوارچێوەی بەرپرسیارییەتی فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە.

٣ـ ئامۆژگاری و پێشکەشکردنی تێڕوانین و ڕای خۆی

ئەمەش لە ڕای گشتی، بەتایبەتی ئەگەر ئافرەتەکە پەیوەندی هەبوو بە چاکسازەکەوە وەکوو ئەوەی مێردی بێت، یاخود وەکوو ئەوەی توانای ئامۆژگاریت بەسەریدا هەبێت. وەکوو «ئوم سەلەمە» کاتێک لە ڕێکەوتنی حودەیبییە ئامۆژگاری پێغەمبەری (ﷺ) کرد، یاخود وەکوو «فاتیمەی سەمەرقەندی» کە پێشتر باسمان کرد.

٤ـ پشتیوانی و یارمەتیدانی چاکەکاران

کە دەکرێت ئەمەش بخرێتە چوارچێوەی ئەرکی پێشووەوە.

## بەرپرسیارییەتی سێیەم - بەشی سێیەم: گەواهییەکان لەسەر ئەو ئافرەتانەی کە بەم بەرپرسیارییەتییە هەستاون:

گەواهی یەکەم: لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە لە زەیدی کوڕی ئەسلەم، کە ئوم دەرداء لە کۆشکی عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕواندا بوو، شەوێکیان کاتێک عەبدولمەلیک لە شەودا هەستا، بانگی خزمەتکارەکەی کرد، وەکوو چۆن بڵێیت دواکەوت بەدەمییەوە بچێت، عەبدولمەلیک نەفرینی لێ کرد،

بۆیە کاتێک ڕۆژ بوویەوە، ئوم دەرِدا پێی وت: «بیستم ئەمشەو نەفرینت لە خزمەتکارەکەت کردووە.» منیش لە ئەبوو دەرداوە بیستوومە، دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: «لا يكون اللعانون شفعاء ولا شهداء يوم القيامة» [مسلم: ٢٥٩٨] واتا: «ئەو کەسانەی نەفرین دەکەن لە ڕۆژی دواییدا نە دەبنە شەفاعەتکار و نە دەبنە شایەت!» کە ئەمەش گەواهییە لەسەر ڕێگری لە خراپە لەسەر ئاستی بەرزترین هەیکەلی کۆمەڵگە، کە ئەوەشی پێی هەستا ئافرەتێک بوو، نەشی وت لە ڕۆڵ و بەرپرسیارییەتی من نییە، کە ڕێگری لە خراپییەک بکەم.

گەواهی دووەم: هەروەها قوتابییەکەی ئیبن تەیمییە (فاتیمەی کچی عەباس) کە ئامادەی وانەکانی دەبوو و پرسیاری لێ دەکرد، ئیبن کەسیر وەسف و سەنای دەکات بەوەی ڕێگری لە پیاوانی تاقمی ئەحمەدییە و موورِدان دەکرد کە دوو گرووپی گومڕا بوون، ئیبن کەسیر لە پەڕتووکی (البداية والنهاية) دەڵێت: «کارگەلێکی لەو بوارەدا کرد کە پیاوانیش ناتوانن بیکەن.»

جگە لەمانەش نامەیەکی جوان هەیە بە ناوی (مسؤولية المرأة في الأمر بالمعروف و النهي عن المنكر) لـ د. فضل إلهي؛ کە نزیکەی حەفتا گەواهی لەسەر فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپەی تایبەت بە ئافرەتان تێدا کۆ کردووەتەوە.

## بەرپرسیارییەتی سێیەم - بەشی چوارەم: پێشنیاری زانستی

پێشنیاری یەکەم: زیندووکردنەوەی بەخێوگەی پەروەردەیی بۆ ئافرەتان، ئەمە لەو پرۆژانەیە کە وای دەبینم لە پرۆژە زۆر گرنگ و پێویستەکانە و

هەروەها نوقسانییەکی زۆرمان هەیە لەم بارەیەوە، لەو پڕۆژە گەورە و سەرەکییانەیە کە نابێت دواخستنی تێدا بکرێت.

خودی ئەم پڕۆژەیە پێش خۆی پێویستی بە پڕۆژەیەکی دیکە هەیە کە ئەویش پڕۆژەی دروستکردنی پەروەرشیارە. پێویستە کە بایەخ بدرێت بە ئافرەت لە بابەتی پەروەردەدا، سا چ لە ڕووی جێبەجێکردنی کردەیی بێت، یاخود لە ڕووی لایەنی زانیاری پەروەردەییەوە، دوای ئەوەش ڕۆڵی لە بابەتی پەروەردەی کردەییدا، ئەمەی باسمان کرد دوو پڕۆژە بوو.

پێشنیاری دووەم: بەرهەمهێنانی ئافرەتانێکی تایبەتمەند لەو بابەتە فکری و پەیوەست بە ئافرەتانەی کە دێنە پێشەوە، سا چ تایبەتمەندبن لە ڕووی ئامۆژگاریکردن و وەڵامدانەوەی ڕاستەوخۆ، یاخود تایبەتمەندبن لە ڕووی لێکۆڵینەوەوە. ئەمڕۆ کێشەکانی وەکوو فیمینیزم و هەروەها کاریگەری جەنگەکان لەسەر کچ و ئافرەت و کۆچبەرەکان، کاریگەری ئەوانە لەسەر فکر و بابەتی بەمەسیحیکردن و گومان و ئیلحاد ... تاد. لە دۆسییە بەیەکدادراوەکانی ئەم لایەنەن، کە بەڕاستی پێویستی بە ئافرەتانی تایبەتمەند هەیە، هەروەها ئەم بابەتە بەشێکی دەگەڕێتەوە بۆ کەمی کەسانی تایبەتمەندەکان بەشێوەیەکی گشتی لەم لایانانەدا و لاوازییەکی گشتییە کە پیاوانیش دەگرێتەوە. بێگومان ئەمەش پڕۆژەیەکی دیکەی دەوێت لەپێش خۆیەوە: کە ئەویش پڕۆژەی بونیادنانی هەڵبژاردەیەکە لە ئافرەتان، کە توانای فکری و ئامڕازی گەڕان و شەرعییان هەبێت لە بواری جیاوازدا، چ لە بواری پەروەردەییدا بێت، یاخود جگە لەو.

پێشنیاری سێیەم: جێبەجێکردنی کردەیی

ئەمەش دوای تێپەڕینێکی خێرا و مامناوەندانە بە بابەتی ئافرەت و نەخشەی

بەرپرسیارییەتییەکانی، پێم وایە بەم سەرچاوانەی کە لە دەقە شەرعییەکاندا هەیە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی نەخشەی پەیوەست بە ئافرەت لە ئیسلامدا زۆر فراوانترە لەوەی کە هەندێک تەنگی دەکەنەوە، یاخود بە لای زۆرەوە هەندێکیان مەوداکەی کەم دەکەنەوە. هەروەکوو پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: «أيها الناس، إنكم لن تطيقوا - أو لن تفعلوا - كل ما أمرتم به، ولكن سددوا وأبشروا» [سەحیح سونەن ئەبو داود: ١٠٩٦] واتا: «ناتوانن هەموو ئەوە جێبەجێ بکەن کە فەرمانم پێ کردوون، بەڵام مرۆڤ دەبێت ئەو کارەی دەیکات بیپێکێت و نزیکی بکاتەوە لەوەی کە دەویسترێت.»

گوشراوی مەبەست: لە پێویستییەکانی ئەمرۆ لە هەموو سەردەمێکدا، بەڵام لەمرۆدا بەشێوەیەکی گەورەتر. زیندووکردنەوەی بەهای ئافرەتە لەلای خودی خۆی، بەوەی پەی ببات کە لەم دونیایەدا دروستکراوە بۆ ئامانجێکی گەورە و بەرپرسیارییەتی گەورەی لەسەرە، هەروەها ئەم بەرپرسیارییەتییانەش هەندێکیان پەیوەستە بە ڕزگاربوونی خۆیەوە، کە ئەمەیان هیچ هەڵبژاردنێکی دیکەی تێدا نییە، هەر بۆیە فەرمانکراوە بە پابەندبوونی و کردنی کردەوەی چاکە، لە خواترسان و دوورکەوتنەوە لە حەرام. ئەمەش ئاستی هەستانەوەیە کە پێی هەڵدەستێت، بە جۆرێک بەرگە دەگرێت، پابەند دەبێت، دامەزراو دەبێت و پێشی دەخات بۆئەوەی بەرگەی زیاتر و زیاتر لەوەش بگرێت، ئەگەر پەی بەوە برد کە موسڵمانە، ئەوا خەمی ئیسلامی دەکەوێتە سەر و ئەگەریش پەی بەوە برد کە باوەڕدارە، ئەوا سەرخستنی باوەڕدارانی دەکەوێتە سەر، لەبەرئەوەی خودا دەفەرمووێت: ﴿وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ۚ﴾ [التوبة: ٧١] لە پێویستییەکانی باوەڕداریش سەرخستنی هاو باوەڕەکەتە بەوەی پێت دەکرێت و لە تواناتدا هەیە.

بەڵام ئەگەر لە دەروون و ناخیدا هیچ شتێک نەبێت و ئاوات و هیوا و ویست و ڕەفتارەکانی بازنەی دونیا تێنەپەڕێنێت، ئەوا چاوەڕێی ئەوەی لێ ناکەین کە هیچ ڕۆڵێکی هەبێت، تەنانەت بە لای کەمیشەوە توانای پارێزی نابێت لە بەرانبەر ئەم هەموو هەڵمەتانەی کە ئاراستەی دەکرێن.

کۆتایی قسەکەم بەوە دێنم کە کارکردن بۆ ئیسلام لە ئەمڕۆدا، شتێک نییە بە گاڵتە وەربگیرێت، ئێمە لە بارودۆخێکدا نین کە توانای گوێنەدان و ڕابواردنمان هەبێت و قاچەکانمان لەسەر قاچ دابنێین و بڵێین: «ئەی هاوڕێینە! ڕاتان چییە، باری ئافرەتمان بە دڵ نییە، بۆچی شتێک نەکەین ...؟» کارکردن بۆ ئیسلام بەم شێوەیە نییە، بابەتەکە بەو شێوەیە کە ئەوەی بەسەر ئیسلام و موسڵماناندا دێت ئەمڕۆ، زۆر گەورە و مەزنترە لەوەی عەقڵ بتوانێت خەیاڵی بکات، لەسەر ئاستی فکری و ڕەوشتی و ڕەفتاری و ... تاد.

ئەوەی ئەمڕۆ پێویستە ببین، ئەوە نییە هەندێکمان هەندێکی ترمان بخەین و شەڕ لەنێوان خۆماندا بکەین، بەڵکوو ئەوەی ئەمڕۆ پێویستە لەسەرمان سەربەرزکردنەوە و ڕوانینە لە پێشەوەمان و پەیبردنە بەوەی چ شتێک لەپێشتر و گرنگترە بۆ بارودۆخی موسڵمانانی ئەمڕۆ، بەتایبەت ئەوەی پەیوەستە بە نەوە نوێیەکان، کە وتم «نەوەکان» و تۆش ڕۆڵی ئافرەتت ڕەت کردەوە، ئەوا پایەیەکی سەرەکیت ڕەت کردووەتەوە، تەنانەت ئەگەر بە بەرنامە کارت بۆ نەوەکان دەکرد، بەڵام دەستێکی تر نەبێت بێتە ناو دەستت لەناو ماڵەکەتدا، ئامادە بیت و کار بکەیت، ئەوا ناتوانێت کارێک بکەیت کە پێویست بێت.

هەربۆیە کارکردن بۆ ئیسلام شتێک نییە بە گاڵتە وەربگیرێت و کاتێکیش دەڵێین: «ڕۆڵی ئافرەت» ئەمە بۆ ڕابواردن و خۆشی نییە! بەڵکوو لە

پێویستییەکانە.

واقعەکەیش ئەوەمان بیر دەخاتەوە کە پێویستە ئافرەت لە شکۆ و ڕێزی بەرزی و مەزنی دەروونیدا بێت و هەروەها پەی بە بەهای ئەوە ببات کە دەتوانێت چی بکات، ئەمە ئەوەمان بیر دەخاتەوە کە ئافرەتان لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) هەستیان پێ دەکرد، ئەو هەستانەی کە وای لێ کردن هەستنەوە و کێبڕکێ بکەن کاتێک پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: «خەڵکانێک لە ئوممەتەکەم سواری کەشتی دەبن لەنێو دەریادا بۆ غەزاکردن.»[1] ئافرەتەکانیش بڵێن: «ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە خودا بۆمان بپاڕێرەوە کە ئێمەش لەوان بین ...» ئەو هەستانە بوو کە وای لێ کردن بڕیاری ترسناک بە نیسبەت ترسناکی ڕێگا و بێویژدانی بێبڕوایان بدەن و لە مەککەوە کۆچ بکەن بۆ مەدینە بۆ گەیشتن بە پێغەمبەر (ﷺ)، بەتەنیا و بەو لاوازی پێویستییەی خۆیە، بەڵام بە ئایینەکەیەوە هەڵبێت. ئەو هەستانە بوون کە وای لێ کردن بە دامەزراوەیی بمێننەوە کاتێک پیاوەکەی لە زەوی بێگانەدا هەڵگەڕایەوە.

ئەو هەستانە بوون کە وای لێ کردن نەلەرزن کاتێک لەبەرانبەر زاڵمێکی و تاوانکاری وەکوو حەجاج بوەستن ئەوەی پێ بڵێن کە وتیان، حەجاجیش بڵێت: «بە قژت ڕاتدەکێشم!» پەروەردەی پێغەمبەری (ﷺ) بوو کە گەیاندنیانییە ئەو ئاستی شکۆداری و پێگەیە.

---

(١) «قال رسول الله ﷺ " ناس من أمتي يركبون البحر الأخضر في سبيل الله، مثلهم مثل الملوك على الأسرة ". فقالت: يا رسول الله ﷺ، ادع الله أن يجعلني منهم. قال: " اللهم اجعلها منهم» پێشەوا بوخاری گێڕاویەتییەوە بە ژمارە (٢٨٧٧)

# ئافرەت لە بەرانبەر ئاڵنگارییەکاندا

## بەشی یەکەم: ڕێڕەوێکی خێرا -کە سێ خاڵی لەخۆ گرتووە-:

خاڵی یەکەم: هەروەکوو چۆن نەخشەی بەرپرسیارییەتییەکانی پەیوەست بە ئافرەت نەخشەیەکی فراوان و گەورە و جۆراوجۆرە، بە هەمان شێوە ئاڵنگارییەکانیش نەخشەیەکی فراوان و گەورە و جۆراوجۆریان هەیە. هەندێک جار ئافرەت توانای نییە کە ڕووبەڕووی ئاڵنگارییەکان ببێتەوە، چونکە نەخشەی ئاڵنگارییەکان بە لایەوە ڕوون نییە، ئەگەر لە هەمان کاتدا بە کێشە کۆمەڵایەتییەکان و کێشە دەروونییەکانەوە بناڵێنێت بە جۆرێک کە تێکئاڵاو بن و بچڕبچڕ تووشی نەبن، هەر بەتەنیا بە پەیبردن بە نەخشەی گشتی ئاڵنگارییەکان، مایەی دڵنیایی و ئارامییە، چونکە هیچ نەبێت ئەوە دەبینم کە پێویستە ڕووبەڕووی چ شتێک ببمەوە.

خاڵی دووەم: ئەم سەردەمە لە ناڕەحەتترین سەردەمەکانە لە ڕووی ئەو ئاڵنگاریانەی کە ڕووبەرووی ئافرەتی موسڵمان دەبێتەوە، لە هەمان کاتدا بوونی زۆر کۆڵەگە و لایەنی ترن، کە مایەی بەردەوامی و بەهێزی ئاڵنگارییەکانن.

هەر بۆیەش لەم سەردەمەدا، ئافرەتی موسڵمان زۆرترین پێویستی هەیە بە: خۆبونیادنان، بەهێزی، خۆڕاگری، دامەزراوەیی و ئارامگرتن.

خاڵی سێیەم: لە کاتی خوێندنەوەی نەخشەی ئاڵنگارییەکان، پەی بەوە دەبەین کە چارەسەر و ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم ئاڵنگاریانە، باشتر وایە کە

بەشێوەی تەواوکاری وەربگیرێت نەک بە شێوەی تاکەکەسی، گونجاو نییە دوای بینینی هەموو ئەم ئاڵنگارییانە، ئافرەت وەها مامەڵە بکات کە بەتەنیا ڕووبەڕووی خودی خۆی دەبێتەوە و شتێکی تاکەکەسییە. نەخێر، بەڵکوو ئەمە ئاڵنگاری زۆربەی ئافرەتانە.

هەربۆیە باشتر وایە کە باسی چارەسەرەکان دەکەین بەتەنیا هەستنەکەین کە تەنیا خودی خۆمانی گرتووەتەوە، بەڵکوو هەستبکەین بەوەی کە کێشەیەکی گشتییە، چونکە کێشەیەک گشتی بێت، چارەسەری کرداری و نموونەی کەسانێک هەن کە ئەم ئاڵنگارییەیان تێپەڕاندووە، بەم شێوەیە زیاتر کاریگەری دەبێت لەسەر ئەوانی تر بۆ تێپەڕاندنی ئاڵنگارییەکان.

## بەشی دووەم: نەخشەی ئاڵنگارییەکان

ڕاپرسییەکمان بڵاو کردەوەی دەربارەی دیارترین ئاڵنگارییەکان کە ڕووبەڕووی ئافرەت دەبێتەوە، چاوەڕواننەکراو نەبوو کە زۆربەی وەڵامەکان، نزیکەی لە سەدا شەستی ئاڵنگاری کۆمەڵایەتی و دەروونی بوون، لە سەدا چلیشی دابەشبووبوو بەسەر ئاڵنگارییە فکری و گومان و چاکسازی و بانگەوازییەکانەوە. کێشەیەک هەیە کە دەبێت ڕوونکردنەوەی لەسەر بدەم: زۆرجار لەکاتی چارەسەرییە شەرعییەکاندا بۆ بابەتی ئافرەت، ڕەچاوی لایەنی کۆمەڵایەتی و دەروونی ناکرێت، بانگخواز کاتێک قسە دەکات، ڕەچاوی ئەوە ناکات کە ئاڵنگاری کۆمەڵایەتی و دەروونی لە چوارچێوەی ئاڵنگارییەکانی تردا بە هەمان شێوە ڕووبەڕووی ئافرەت دەبنەوە، هەربۆیە ئامۆژگارییەکان تەنیا ئامۆژگاری گشتیین و ئەم باسە لەخۆ ناگرن. ئەمەش

بۆ خۆی کێشەیە، چونکە دیارترین ئەو کێشانەی کە بەربڵاو و کاریگەرن، ئاڵنگارییە کۆمەڵایەتی و دەروونییەکانن.

## چەتری ئاڵنگارییەکان

یەکەم: ئاڵنگارییە فکری و ڕۆشنبیرییەکان

دووەم: ئاڵنگارییە کۆمەڵایەتیەکان

سێیەم: ئاڵنگارییە دەروونییەکان

چوارەم: ئاڵنگاری دامەزراوەیی و خۆڕاگری «لەلایەنی خودی و تاکەکەسییەوە»

پێنجەم: ئاڵنگارییە بانگەوازی و چاکسازییەکان

من لێرەدا قسە لەسەر ئافرەتێکی موسڵمان دەکەم، ئافرەتێک کە زۆنگاوی ڕابواردن و ڕەگەڵکەوتنی دەریای هەڵە و تاوانەکانی تێپەڕاندووە، هەروەها هەوڵی داوە کە دەروونی خۆی بەرز بکاتەوە و هەنگاو بەرەو پێشەوە بنێت، نەک لەسەر ئافرەت بە شێوەیەکی گشتی.

هەربۆیە ئەم پێنج چەترە ئەوانەن کە زۆربەی ئەو ئاڵنگاریانەی ڕووبەڕووی ئافرەتێ دامەزراو دەبنەوە لەم سەردەمەدا، لەخۆ دەگرن.

## چەتری یەکەم: ئاڵنگارییە فکری و ڕۆشنبیرییەکان

لەژێر ئەم چەترەدا، چوار ئاڵنگاری، یاخود ڕەوت هەن کە هەڕەشەن بۆ سەر

ئافرەتی موسڵمان:

١ـ ئاڵنگاری ڕەوتی فیمینیزم و تێڕوانین و گومانەکانیان

٢ـ ئاڵنگاری ڕەوتی بێباوەڕی و بێئایینی

٣ـ ئاڵنگاری ڕۆشنبیری ئیسلامی نەرمڕەوانە

٤ـ ئاڵنگاری ڕۆشنبیری ئیسلامی توندئاژۆییانە

یەکەم: ڕەوتی فیمینیزم

دیارترین شێوەی ئاڵنگاری ئەم ڕەوتە، کە ڕووبەڕووی ئافرەتان دەبێتەوە: تین بۆ هێنان و پاڵنانی ئافرەتە بۆئەوەی لە قەفەسی مافە دونیاییەکاندا کۆت بکرێت، ئافرەت وەهای لێ دێت، ئەم قەفەسە تاکە مافێکە کە لەپێناویدا کۆشش دەکات، هەرکاتیش پێی گەشت، لەپێناو ئەم پانتاییە تەنگە، لێپرسینەوە لە ئیسلام و هەموو بنەماکان دەکات!

ئەگەر بوترێت لە ئیسلامدا ئەم ئایەتەمان هەیە: ﴿الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاءِ﴾ [النساء:٣٤] واتا: «پیاوان سەرپەرشتیارن بەسەر هاوسەرەکانیانەوە.» ئەوا لەسەر بنەمای ئەو پانتاییە تەنگە، دادگایی دەقەکە دەکات! هەروەها ئەگەر لە ئیسلامدا دەقانێک هاتبن بۆ گوێڕایەڵی مێرد، بە هەمان شێوە لەسەر بنەمای ئەو قەفەسە، دەقەکە دادگایی دەکات! هەموو شتێک دەخەنە ژێر سایەی قەفەسی مافە دونیاییەکان، لەژێر سایەی پێناسەیەک، کە لە سێبەری ئایین دابڕاوە، هەربۆیە ئەوەی ئایین و شەرع بێت، ئەوا لەسەر بنەمای ئەم تێڕوانینە دادگایی دەکرێت، ئەمەش کێشەیەکە لە کێشە زۆر ترسناکەکان!

ئەو ئافرەتانەی کە کاریگەر دەبن بەم کێشەیە، دوو بەشن:

بەشێک لەو ئافرەتانە بنەما شەرعییەکانیان لە لا ئاسان دەبێت و، بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ئیسلام ستەم لە ئافرەت دەکات، یاخود دەیەوێت جاڕی ئەوە بدات کە ئیسلام زۆر ژیاندۆست و ئاشتیخوازە، بۆیە ئیسلام وەلا دەنێت لەوەی ئیسلام دەستوەربداتە هەر بابەتێکی کۆمەڵایەتی و جگە لەویش، ئیسلام کورتهەڵدێنێت لەوەی بابەتێکی ڕۆحییە و پەیوەستە بە نێوان مرۆڤ و خوداوە.

بەشێکی تریان خۆیان لە ئیسلام بێبەری ناکەن و ئیسلام لەبار نابەن، بەڵام کاریگەر بوونە بە فکری فیمینیزم، بۆیە دەست دەکات بە لێکدانەوەی ئایەتەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بە گوێرەی ئەوەی هاوواتای ئەم تێڕوانینە بێت، دواتر ئافرەتەکە لەژێر کاریگەری ئەم گومان و کێشە فیمینیزمیانە گومڕا دەبێت و زنجیرەی لێکدانەوەی دەقەکانی سرووش بەزۆری سەرکەوتوو نابێت، ڕەنگە سەرەتا فیمینیزمێکی ئیسلامی بێت، بەڵام دواتر بڕواتە نێو فیمینیزمی عالەمانی، یاخود بێباوەڕی.

دووەم: ڕەوتی بێباوەڕی

بەگوێرەی ئەوەی ساڵانێکی زۆرە گرنگی بەم بابەتی بێباوەڕییە دەدەم، بە زۆر دۆسییەی ئافرەتدا تێپەڕیوم کە بێباوەڕ، یاخود بێئایین بوونە، بۆم دەرکەوتووە ئەم بابەتە کێشەیەکی هەقیقییە و لاوەکی نییە.

لێرەدا پرسیارێک دێتە پێشەوە: ئایا هۆکاری ئەم بێباوەڕبوونە، تەنیا هۆکاری فکرییە؟ نەخێر، بەڵکوو هۆکاری کۆمەڵایەتیش کاریگەری هەیە، بەڵام لێرەدا باسەکەمان لەسەر لایەنی فکرییە.

دیارترین شێوەی ئاڵنگاری ڕەوتی بێباوەڕی کە دەکرێت ڕووبەڕووی ئافرەتان ببێتەوە، ئەم گومانەیە: ئیسلام ستەمی لە ئافرەت کردووە و ڕێزی لێ نەناوە، دوا بە دوای ئەوەش، هێرش بۆ سەر ئیسلام، ئەم بڕیاردانەشیان لەسەر تێڕوانینە تەنگەکەی پێشوو بنیاتنراوە: «مافە دونیاییەکان»، لەبەرئەوەی وای دەبینێت دادگەری تەنیا لە چوارچێوەی بابەتە دونیاییەکاندایە، ئیدی هەر شتێک پێچەوانەی مافە دونیاییەکان بێت، بە ستەمی دادەنێن، دواتر چونکە لە لایەک پێی وایە ئایین تەواو و کاملە و لە لایەکی دی پێی وایە ئایین ستەمی کردووە. لە خەیاڵیدا دژیەکییەک دروست دەبێت، بۆیە لە ئەنجامدا بەتەواوی خۆی بێبەری دەکات لە خودی ئایینیش (بۆئەوەی بە گومانی خۆی لەم کێشمەکێشمە دەروونییە دەربازی ببێت.)

سێیەم: ڕەوتی ڕۆشنبیرییە ئیسلامییە شلڕەوەکان

هەندێک جار لەژێر کاریگەری ڕەتدانەوەی کۆمەڵگە، یان هەندێک نەریتی توندئاژۆ، یاخود بوونی داخراوییەک، ڕەوتی شلڕەو نایانەوێت ئافرتی موسڵمان واز لە ئایین بهێنێت، هەربۆیە لەژێر سایەی ڕۆشنبیرییەکی ئیسلامی شلڕەوانە، دەیانگرنە خۆ کە ئافرەت تێیدا سنووری حەڵاڵ و حەڕام و هەروەها پابەندبوونی بە سنوورەکانی خوا نازانێت. لەژێر سایەی هەندێک واتای ڕووحانی و خۆشەویستی و بۆن و بەرامی ئاشتی کە هەموو لایەکانی دەگرێتەوە، لەژێر سایەی گەلێک دروشمی هەستبزوێن، ئافرەت لەخۆ دەگیرێت، کە لە هەقیقەتی و ناواخنی ئەم ڕۆشنبیرییەدا، ڕێگەی تەواوی خواپەرستی ناگیرێتە بەر، بەڵکوو هەندێک دەستکەوتی دەروونی تێدا بەدەست دێت کە هەندێک جار

دەگات بە خۆپێگەورەبوون و دروستکردنی وێنەیەکەی ناڕاست و بەدەستهێنانی سەرکەوتنی ساختە، تێگەیشتن لە ئیسلام بە تێگەیشتنێکی دونیایی، کە هەموو ئەوەی ئیسلام دەستەبەری دەکات بەتەنیا ئاوەدانی و خۆشی ماددییە، بەداخەوە ئەم ڕۆشنبیرییە لە ئەمڕۆدا زۆر بەربڵاوە.

لەژێر سایەی ئەم ڕۆشنبیرییەدا، لە ڕووی هەڵسوکەوتەوە هیچ جیاوازییەکی گەورە لەنێوان ئافرەتی موسڵمان و جگە لە موسڵمان نامێنێت، بەڵکوو تەنیا لە هەندێک خواپەرستیدا نەبێت، کە ئەویش ڕۆحی بەندایەتی تێدا دەستەبەر نابێت.

چوارەم: ڕەوتی ڕۆشنبیرییە ئیسلامییە پەڕگیرەکان

ئەم ڕۆشنبیرییە چەند شێوەیەکی هەیە، کە هەندێکیان کاریگەری لەسەر فکر هەیە و هەندێکی دیکەش کاریگەری لەسەر ئایین هەیە، چونکە زۆربەی کاردانەوە نەرێنییەکان بەهۆی ئەم ڕۆشنبیرییەوەیە. لە گەورەترین شێوەکانی ڕاگرتنی خەڵکی لەسەر هەق: باڵفتەکردنییەتی لەو زیادەڕەوییانەی کە تێیدایە، هەروەک چۆن ئیسلام شەڕی ئەوانەی کردووە کە لە هەق کەم دەکەنەوە، بە هەمان شێوە ڕەنگە توندتریش شەڕی ئەوانەی کردووە کە زیادەڕەوی لە هەقدا دەکەن. ئافرەت کاتێک کاریگەر دەبێت بە ڕۆشنبیرییەکی پەڕگیرانە، زۆربەی جار کارتێکردنکە بەهۆی فکرەوەیە، بە پێچەوانەی پیاوەوە کە بەهۆی بارودۆخی کۆمەڵایەتی و هۆکاری دەروونی و ئەزموونی کەسییەوە کارتێکراو دەبێت. هەروەها هەرگیز پێت سەیر نەبێت ببینیت ئافرەتێک بە هەموو هێز و توانای خۆیەوە، پشتگیری ڕۆشنبیرییەکی شەرعی بکات کە پێغەمبەر (ﷺ) نەی هێنابێت، ئەگەرچی ڕۆشنبیرییەکەش توند بێت لەسەر خودی ئافرەت،

کەچی پشتگیری دەکات و پێی وایە ئەوە هەق و دامەزراوەییە، لەکاتێکدا دامەزراوەیی و هەق هەمیشە هاوتای سوننەتن، نەک هاوتای ئەوەی کە مرۆڤ تێیدا باڵادەستە.

لە شێوەکانی ئەم ڕۆشنبیرییەش: کێشانی پانتاییەکی تەنگ بۆئافرەت بە شێوەی ڕاستەوخۆ، یاخود ناڕاستەوخۆ. بە جۆرێک کە ڕەنگە ڕۆڵ و بەرپرسیارییەتییەکانی ئافرەتی موسڵمان تەنیا لە بابەتی گوێڕایەڵی مێرددا سنووردار بکات. ئێمەش کە قسەمان لەسەر نەخشەی بەرپرسیارییتییەکان کرد، بابەتی گوێڕایەڵی ئافرەتمان بە شتێکی هاکەزایی دانەنا، بەڵکوو بابەتێکی سەرەکییە، بەڵام سنووری فقهی و شەرعی خۆی هەیە و لە پێش و پاشیدا بەرپرسیارییەتی تر هەن، ئەسڵەن هەندێک ئافرەت هەن ئەم جۆرە بەرپرسیارییەتییە ئەو ئافرەتانەی هاوسەرگیرییان نەکردووە نایانگرێتەوە، هەر بۆیە هەڵەیە پیشە و بەرپرسیارییتییەکانی ئافرەت سنووردار بکەی لە تەنیا بابەتێکدا، وەکوو ئەوەی پانتاییەکی تەنگ بۆ ئافرەت دروست بکەیت و ئافرەتیش وا خەیاڵ بکات کە تەنیا بوونی لەم دونیایەدا، لەبەر ئەو پانتاییەیە.

هەر بۆیە دەبێت کاتێک قسە لەسەر ئافرەت دەکەین، ڕەچاوی هەموو بارودۆخەکانی بکەین، چ شووی کردبێت، یاخود نا، خۆ ئەگەر شوویشی کردبوو، هەڵەیە کە بەرپرسیارییەتییەکانی لە بابەتێکدا سنووردار بکەیت. بۆیە کاتێک قسەمان لەسەر ئافرەت کرد لە کۆمەڵگەی پێغەمبەریدا (ﷺ)، بینیمان ئافرەت بە چ ئاستێکی گەورەی بۆشاییەکانی پڕ کردبوویەوە، ئەوە ئەو پەیامە هەقیقییە دادگەرە بوو کە ئافرەتی پێ دەدوێنرا و وەهای لێ کرد توانای ئەوەی هەبێت بە پانتاییەکی فراوانی بەرپرسیارییەتییەکان هەڵبستێت، نەک بە تەنیا لە پانتاییەکی تەنگدا.

هەروەها یەکێکی تر لە شێوەکانی ئەم ڕۆشنبیرییە: لەکاتی فێرکردنی ئافرەتاندایە، لێرەدا مەبەستم پێی فێربوونی زانکۆ یاخود ڕێکخراو و سیستەمی قوتابخانەکان نییە، بەڵکوو مەبەستم لە مافەکانییەتی، لە فێربوونی تایبەتی زانستە شەرعی و ئیسلامییەکان، بگرە نەک هەر فێربوون، بەڵکوو کاریگەری فێربوونەکەش، هەندێک جار پانتاییەک بۆ ئافرەت دەکێشرێت و وا تێدەگەیەنرێت کە هەموو ئەوەی پێی بگەیت لە زانستدا، فێربوونی حوکمە سەرەکییەکانی پەیوەست بە ئافرەتە، بەڵام هیچ دەرگایەکی پێشکەوتنی بۆ ناکەنەوە بۆئەوەی ببێت بە زانا، یان شەرعزان، یاخود تایبەتمەند ببێت لە هەندێک بابەتی زانستی کە بۆ ئوممەتی ئیسلامی گرنگە.

بۆیەش ئەمڕۆ ئێمە خەریکی چنینەوەی کۆمەڵێک بەرهەمی خراپی ئەو جۆرە ڕۆشنبیرییەن کە دەربارەی فێربوونی ئافرەت و سوودبینینی لە زانست بوونی هەیە، ئەمڕۆ ئێمە زۆر پێویستمان بە ئافرەتانی بە توانا و لێکۆلەر و بەهێز و مامۆستا هەیە کە ڕووبەڕووی ئەو کێشانە ببنەوە کە تووشی ئافرەتان دەبێت.

ئەگەر لە واقعی ئەمڕۆدا بڕوانین، توانای ئافرەتان چەندێکە لە ڕووبەڕووبوونەوەی پرسەکانی پەیوەست بە ئافرەت؟ بەداخەوە زۆر کەم!

ئەی ئیتر بۆچی پێشتر ئامادەکاری نەکرا بۆ پرسێکی لەم چەشنە؟

ئێمە لەم سەردەمەدا بەدەست کێشەوە دەناڵێنین، هەروەها چاوەڕوان دەکرێت کە کێشەی فێمینیزم و کاریگەرییەکانی لە داهاتوودا گەورەتر ببێت، ئەی ئیتر بۆچی ئەمڕۆ کۆشش ناکەین بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم کێشەیە؟ ئەویش بە کرانەوەی ئاسۆی بیرکردنەوەکان و بە شێوەیەکی زانستی و ورد و قووڵ ئافرەتان فێر بکەین، بۆئەوەی بۆ ڕۆژێکی لەم چەشنە، ئامادەیی هەبێت؟!

ئەمەش یەکێک بوو لەو شتانەی کە زۆرجار ڕێگرەکەی ڕۆشنبیرییەکی شەرعی پەڕگیرە. لەبەرانبەریشدا: ڕۆشنبیرییەکی شەرعی شلگیرمان هەیە کە خۆفێرکردن و گەشەپێدانی خود بە گەورە دەگرن، بەڵام بەبێ گرنگیدان بە بابەتە ئیسلامییەکان، کە پێویستە ئافرەت بایەخیان پێ بدات. هەربۆیە بابەتە گەورەکانی پەیوەست بە ئافرەت و دامەزراوەیی و خۆڕاگری بەفیڕۆ چووە، لەنێوان ئەم دوو ڕۆشنبیرییەتەدا.

لە گەورەترین ڕێگاکانی ڕووبەڕووبوونەوەی ئالنگارییە فکری و ڕۆشنبیرییەکانیش: دووبارە گێڕانەوەی ناوەندی فێربوون و فێرکردنە بە نیسبەت ئافرەتەوە بەشێوەیەکی شەرعی قووڵ و پتەو.

## چەتری دووەم: ئاڵنگارییە کۆمەڵایەتییەکان

ئەمەیان دەریایەکە کەناری نییە ...! ئەم بابەتە لایەنێکی زۆر گەورەیە و قورسە لە چوارچێوەیەکی مامناوەند و سادەدا بیگەیەنیت.

دیارترین ئاڵنگارییە کۆمەڵایەتییەکان:

١- ڕۆشنبیری کۆمەڵایەتی توندگیر. ئەم ڕۆشنبیرییە ڕێگری لە زۆربەی مافەکانی ئافرەت دەکات کە ئیسلام هێناوییەتی، لەژێر سایەی ئەم قسانەدا: «گونجاو نییە و نابێت ...!» هەروەها زۆر جاریش ئەم ڕۆشنبیرییە بەرگێکی ئایینی دەپۆشێت.

٢- ڕۆشنبیری کۆمەڵایەتی شلگیر. کە کوڕ و کچەکان لەناوەوەی ماڵەکانەوە، لەسەر شلگرتنی سنوورەکانی ئیسلام و شەرع پەروەردە دەبن!

٣ـ ڕۆشنبیری کۆمەڵایەتی گوێنەدەر. ئەم ڕۆشنبیریە زەقترە بە بەراورد بە ڕابردووی، ئەمەش دەبێتە هۆی پەروەردەبوونی نەوەیەک کە گوێ بە هیچ نادەن! لایان جیاوازی نییە کە حیجاب بکرێت یاخود نا، پەیوەندیت لەگەڵ گەنجێکدا هەبێت یاخود نا، نوێژ بکەیت یاخود نا ...! بایەخی پێ نادات، گرنگترین شت ئەوەیە بڕوانامە بەدەست بهێنیت، سەرکەوتوو بێت لە قوتابخانە، بڕواتە نێو تایبەتمەندییەکی تازەوە و پیشەیەکی تازە وەدەست بخات ...! ئەمەیە ڕۆشنبیری گوێنەدەر! ڕۆشنبیری پێشوو شلگیر. لەو ڕۆشنبیرییەدا بەتەواوی گوێنەدان نییە، بەڵام ئاستێک لە شلگیری دروست دەکات، کە لە سنوورەکانی خودادا ڕاوەستانی نییە.

٤ـ ڕۆشنبیری کۆمەڵایەتی شەڕانگێز. ئەمە ترسناکترین جۆری ڕۆشنبیرییە! چونکە شەڕ لەگەڵ کەسێکدا دەکەن کە پابەندی ئایین بێت و ئاینداری بکات، کە زۆربەی کچان ئەمڕۆ بەدەستییەوە دەناڵێنن! ئەگەر کچەکە حیجابی پۆشی، پێی دەڵێن توندگیر مەبە! یاخود کچەکە داوای فێربوونی زانستی شەرعی بکات، پێی دەڵێن توندگیر مەبە!

کەواتە ئەم چوار ڕۆشنبیرییە کۆمەڵایەتییە، هەندێک جار هەندێکیان بەرگی ئایین دەپۆشن، کە دەبنە هۆی دروستبوونی ئاڵنگاری دیکە بە نیسبەت ئافرەتەوە، کێشەکە لێرەدایە کاتێک بەرگی ئایین دەپۆشێت، دەبێتە بەڵا بۆی لە ئاییندا، وەیل بۆ ئەو کەسە! وەیل بۆ ئەو کەسەی کە هەندێک لە دەقەکانی پێغەمبەر (ﷺ) وەردەگرێت و بەشێوەیەکی ستەمکارانە مامەڵە لەگەڵ ئافرەتدا دەکات، یاخود هەندێک ئایەتی قورئان وەردەگرێت و بەشێوەیەکی ستەمکارانە مامەڵە لەگەڵ ئافرەتدا دەکات و وای لێ دەکات لە ئایین هەڵبێت، بەهۆی بەکارهێنانی ئەم دەقانە لەجێگەی هەڵەدا ...!

وەیل بۆ ئەوانەی کە بۆ نموونە لەکاتی ناکۆکی کەسیدا دەرباری ئافرەت دەڵێن: (ناقصة عقل ودين) دواتر دێت و ئەم ئایەتە بە بەڵگە دێنێتەوە ﴿واضربوهن﴾ ئەمە لادانێکی کردارییە لە ئایین، ئەمە ترسناکترین شتە کە بکرێت، هەربۆیە بەڕاستی ئافرەتانێک هەن کە بەهۆی ئەمەوە لە ئیسلام هەڵگەراونەتەوە! ڕاستە کە بیانوو نین، بەڵام هۆکارن.

٥- ڕۆشنبیری ترسان. ئەم ڕۆشنبیرییەش لە لایەنی ئافرەتەوە زۆر بەربڵاوە، ڕۆشنبیری توندگیر و شلگیر ئافرەت بەهۆی پیاوێکەوە یاخود ئافرەتێکەوە پێیەوە دەناڵێنێت، بەڵام ڕۆشنبیری ترسان، زیاتر ڕووبەڕووی ئافرەت دەبێتەوە بەهۆی ئافرەتی دیکەوە، هەربۆیە دێی بۆ لای زۆربەی کچان و لێیان دەپرسی: «بۆچی دەست بە ئایینی ئیسلامەوە ناگریت؟» پێت دەڵێت: «دەترسم گاڵتەم پێ بکەن و قسەم لەسەر بکەن ...!»

٦- ڕۆشنبیری وەلانان. کە وەها لە ئافرەت دەڕوانێت: «تۆ کێیت!» ئەم ڕۆشنبیرییە دابڕە، وەلانەرە، پەکخەرە و سڕکەرە، ئەو ڕۆشنبیرییە کە بوونەوەرێکی وەلانراوت بۆ دروست دەکات.

٧- ڕۆشنبیری یاخیبوون. لەو ڕۆشنبیرییانە نییە کە پێشتر بەربڵاو بووبن، بەڵام لەم سەردەمەدا خەریکە پێک دێت و کاریگەری دەبێت کە بە نیسبەت کۆمەڵگەی موسڵمانانەوە شتێکی تازەیە، ئەگەرچی لە پەنجا و شەستەکاندا لە میسڕ بوونی هەبوو، بەڵام دامرکایەوە. بەڵام ئێستا کاری لەسەر دەکرێت، ڕاگەیاندنەکان هانی ئەم جۆرە ڕۆشنبیرییە دەدەن، کە ڕۆشنبیرییەکە وەها لە ئافرەت دەکات ناقایل بێت، ئەگەرچی ئارامگری لای ئافرەتە کەمە، بەڵام ئەم ڕۆشنبیرییە لە ئەنجامی نەبوونی ئارامگرییەوە دروست دەبێت، لەژێر سایەی ماف و هێز و ئازادی.

## چەتری سێیەم: ئاڵنگارییە دەروونییەکان

گیروگرفتێکە لە گیروگرفتەکان بە نیسبەت ئافرەتەوە، ئافرەتان خۆیانن کە بە شێوەیەکی باش لە کێشە دەروونییەکانیان تێدەگەن، هەندێک جار لەلای پیاوان ڕوون نییە. کێشە دەروونییەکان کاریگەرن، بەڵێ کاریگەرێکی هەقیقین، هەندێک جار کاریگەرییەکان لەگەڵ ئەو لاوازییە فیترەتییەی کە خودا لە مێدا دروستی کردووە، یەک دەگرێت، بۆیە دەبێت بە بارودۆخێک لە ئاڵنگارییە دەروونییەکان.

هەندێک بیرکردنەوە هەن، دەبنە کۆسپ و وەستێنەری کۆششی ئافرەتی موسڵمان، لەوانە:

بیرۆکەی یەکەم: بیرۆکەی کامڵی و سەرکەوتن. ئەم بیرۆکەیە زۆرجار کۆسپێکی دەروونییە، سەرکەوتن چییە؟ چ کاتێک خۆم بەسەرکەوتوو دابنێم؟ چ کاتێک وا بزانم کە شتێکم بەدەستهێناوە؟ ئایا چی بکەم بۆئەوەی کامڵ بم؟ ئایا دەبێت بەشێوەیەکی کامڵ هەستم بە جێبەجێکردن؟ فلانە شتم تاقی کردەوە بەڵام سەرکەوتوو نەبووم، هەوڵم دا لەگەڵ فلانە شت بەڵام بۆم تەواو نەکرا، دەکرێت دەست بە شتێک بکەم لەکاتێکدا دەزانمیش کە تەواوی ناکەم؟ پێشتر تاقیم کردووەتەوە دەترسم لەوەی جارێکی دیکەش تاقی بکەمەوە!

ئەم کۆسپ و ئاڵنگارییە دەروونییانە بۆ زۆربەی خەڵکی لەوانەیە شتێکی پووچ بێت و کاریگەری نەبێت، بەڵام لە واقعی ئافرەت و کۆمەڵگەی ئافرەتدا، کاریگەرییەکی زۆر زۆر گەورەی هەیە.

بیرۆکەی دووەم: سەلماندنی خود. دەمەوێت جێگەی بایەخپێدان بێت، بۆچی ڕێزم ناگرن؟ بۆچی دان نانێن بە هەوڵەکانم؟ بۆچی لە من ناڕوانن؟

بیرۆکەی سێیەم: نەبوونی توانای چاک مامەڵەکردن لەگەڵ کۆسپ و ستەم و کێشەکان کە ڕووبەڕووی دەبنەوە. دواتریش دەبێتە هۆی نەبوونی توانا بۆ چارەسەر یاخود تێپەڕاندنی کێشەکە، هەست بە بێتوانایی دەکات بەرانبەر کێشەکەی، بۆیە نەبوونی توانا بۆ چارەسەری کێشەکان و تێپەڕاندنی کۆسپەکان دەبێتە هۆی کێشەی دەروونی، بە جۆرێک بەڕاستی وا هەست دەکات کە ناتوانێت هیچ شتێک بکات.

## چەتری چوارەم: ئاڵنگاری دامەزراوەیی و خۆڕاگری

ئەم ئاڵنگارییە ڕووبەڕووی هەموو موسڵمانێک دەبێتەوە لە هەموو سەردەم و شوێنێکدا، لەم سەردەمەشدا هێندە بەلای ڕابواردنگە و فریودان لەسەر پیاوان و ئافرەتانە، کە ئەقڵ خەیالی ناکات، هەربۆیە ئاڵنگاری پاراستنی ئایینەکەت و لە خواترسانت لەژێر سایەی ئەم واقعەدا، لە ئاڵنگارییە گەورەکانە. بێگومان چەندین شێوەی هەیە، چ لەسەر کۆمەڵگە بێت، یاخود لەسەر تاک، هەربۆیە گرنگە کە ئافرەت خودی خۆی لە ئاڵنگارییە کۆمەڵایەتییەکان سنووردار نەکات، تەنانەت ئاڵنگارییەکانی پەیوەست بە کارکردن بۆ ئایین و بانگەواز بۆ خودا، پێش ئەوە و گرنگتر لەوە ئاڵنگارییەکانی پەیوەست بە بەدەستهێنانی لەخواترسانەوەیە، هەر بەتەنیا ئاوڕدانەوە بۆ ئەم بابەتە کە ئەوپەڕی مەترسییە. هەروەها بە گەڕانەوە بۆ ڕۆشنبیری توندگیر و شلگیر و لەگەڵ ڕەوتە فکرییە توندگیر و شلگرتووەکان، ڕەنگە کۆسپ و بەربەستێک دروست بکات لەڕێی بەدەستهێنانی لەخواترسان و دامەزراوەیی و خۆڕاگری.

شێوەکانی کۆتاییان نایەت، بەڵام گرنگترین هۆکارەکانی کاریگەربوون

بە بەڵاکانی سەردەم چ ئارەزووەکان بێت، یاخود گومانەکان: بڵاوبوونەوەی کاریگەربوون بەو فکرەیە، کەمی نموونەی ئەوانەی لەخواترسانیان بەدەستهێناوە، کەمی پێشەنگەکان، کەمی دامەزراو و دەستگرتووەکان بە ئایینەوە، هەموو ئەمانە هۆکارن.

زۆربەی گەنجەکان بەتایبەت ئەوانەی لە قۆناغی دروستبووندان، کاتێک کچ ئاوڕدەداتەوە لە قوتابخانە، یاخود زانکۆ و دەڕوانێت لەو نموونانەی کە چواردەوریان تەنیوە، دەبینێت کە واقعەکە دژوارە، هەربۆیە زۆربەی کچەکان ئەگەر لە زانکۆ و ئامادەیی دەست بە ئایینەوە بگرن، هەست بە نامۆییەکی هەقیقی دەکات (بەڵام ئای پاداشتیان چەند گەورەیە ...!)

ئێمە لێرەدا باسی چەن شوێنێکی دیاریکراو ناکەین، بەڵکوو باس لە کۆمەڵگەی فراوانی ئیسلامی دەکەین و هەروەها ئەو ئاڵنگارییانەی کە چواردەوری ئافرەتی تەنیوە لە شارە زۆر و جۆراوجۆرەکان، هەندێک ئافرەت و کچی وڵاتی ئیسلامی هەن، دەچێتە زانکۆ دەبینێت ئەوانەی حیجاب ناکەن زیاترن لەوانەی کە حیجاب دەکەن. ئەمەش کێشەیەکی گەورەیە، لەبەرئەوەی پابەندنەبوون بە شتێک، شەڕکردن لەسەر پابەندنەبوونێکی دیکە و هەروەها بابەتی مەترسی ئایین ئەمانە ئاڵنگاری زۆر گەورەن.

جگە لەوانەش: بەڵاکانی زمان و گاڵتەکردن و غەیبەت و پاشملە باسکردن، بەڵای ئارەزووەکان و سەیرکردنی شتی حەڕام و ... تاد. بەگشتی دەتوانین کورتی بکەینەوە لە بەڵای دونیا و جوانییەکانی، لەگەڵ بەڵای کاریگەربوون بە دروستکراوەکان و خەڵکی و سەیرکردنیان.

## چەتری پێنجەم: ئاڵنگارییەکانی ڕێی بانگەواز و چاکسازی

ئەمەیان ڕووبەڕووی ئافرەتێک دەبێتەوە سوپاس بۆ خودا. لەخواترسان و چاکی بەدەستهێناوە و هەندێک کێشەی کۆمەڵایەتی و ئاڵنگاری دەروونی تێپەڕاندووە، سوپاس بۆ خودا کاریگەر نەبووە بە ڕەوتی فیمینیزم و بێباوەڕی ... بەڵام قیبلەنمای ڕێگەکەی لا ڕوون نییە؟! من دەمەوێت ببم بە شتێک، شتێک ئەنجام بدەم، شتێک پێشکەش بە ئیسلام بکەم، دەمەوێت شەرعزان و زانا و بیریار و لێکۆڵەر بم ... بەڵام ڕێگاکە لەکوێوەیە؟

خۆ ئەگەر پێت وتم: «ئەمە ڕێگەکەیە»... بریا پێشت بوتایەم کە ڕێگەی دامەزراویی و گەشتن بە کۆتاییەکەی چۆنە؟!

ئاڵنگارییەکان کە لەم ڕێگەیەدا ڕووبەڕووم دەبێتەوە زۆر زۆرن؛ ئاڵنگاری ئیمانی، ڕەوشت، زانیاری و ... تاد.

خۆ ئەگەر ئەمانەشت بۆم چارەسەر کرد، بەڵام من بەرپرسیارییەتی دیکەشم هەیە، ڕەنگە ئافرەتێکی مێرداربێت و بەرپرسیارییەتی ماڵی لەسەر بێت، هەروەها بەرپرسیارییەتی پەروەردەیی، ئیتر چۆن هاوسەنگی لەنێوان ئەم بەرپرسیارییەتییانە و بەرپرسیارییەتی ئەم ڕێگەیە ڕابگرم؟ هەندێک جار خوێندنی هەیە، باشە چۆن هاوسەنگی لەنێوان خوێندن و بەرپرسیارییەتی ڕێگەکە ـبانگخوازیـ ڕابگرێت؟!

هەربۆیە یەکێک لەو ئاڵنگارییانەی کە ڕووبەڕووی ئافرەت دەبێتەوە، ئالنگاری بانگەواز و چاکسازییە، کە خۆی دەبینێتەوە لە پرسیار دەربارەی ڕێگاکەم لەکوێوەیە؟ کە خودی ئەم پرسیارەش چیرۆکی تری لەژێرەوەیە: ئافرەتانێک هەن کێشەی زۆریان لەگەڵ ڕێگاکاندا هەیە و نازانێت کامە ڕێگا دروستەکەیە، ڕەوتی فلان و فلان و فلان ... منیش نازانم کامە دروستەکەیە،

هەروەها تێیاندایە ئاڕاستە دروستەکەی ناسیووە، بەڵام لەناو ئاڕاستەکەدا نازانێت چۆن بڕوات؟

ئەمانە پرسیارگەلێکی وردن کە ئافرەت زۆر بایەخی پێ دەدات، هەربۆیە باسکردنی چەند یاسایەکی گشتی بۆیان و دواتر جێبەجێکردنی، بە نیسبەت ئافرەتەوە زۆر جار قورسە، بۆیە ئافرەت پێویستی بەوە هەیە کەسێک گوێ بۆ پرسیارەکانی بگرێت دەربارەی ئەو کێشانەی کە تووشی دەبێت لە ڕێگا تایبەتە دیاریکراوەی کە پێیدا دەڕوات، هەرچەندە هەندێک جار وەڵامە گشتییەکان دەکرێت سوودی لێ وەربگرن، بەڵام چالاککردنی وەڵامە گشتییەکان و جێبەجێکردنیان لە ڕێگایەکی تایبەتدا، زۆر جار قورسی تێدایە بە نیسبەت ئافرەتەوە کە ئەمەش بۆ خۆی ئاڵنگارییە.

ئەمەش تێپەڕینێکی خێرابوو بەسەر نەخشەی ئاڵنگارییەکان، مرۆڤ دوای تێڕامان لەم نەخشەیە، لەبەرانبەر دوو شتدایە:

- یان دەڵێت: «خودا پاداشتت بداتەوە، سوپاس بۆئەوەی بێئومێدت کردین، هەروەها بێئومێدکردنی زیاتر و داخستنی بابەتەکە، من خۆم پێم وا بوو کە بابەتەکە قورسە، کەواتە قورسە و قورسە بەڵکوو ئەستەمە ...!»

- یاخود ڕەنگە بەپێچەوانەوە بێت: «سوپاس بۆ خودا ئەوەی باست کرد شتێکی باشە، من دەمزانی کە بابەتەکە بەڕاستی گەورەیە، بەڵام تێگەیشتن لە فراوانی ئاسۆی نەخشەکە، دەبێتە هۆی ئامادەکاری زیاتر، پێکهێنانی زیاتر و هەروەها کارکردن و ڕەنجی زیاتر ...»

# چارەسەرە پێشنیارکراوەکان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئاڵنگارییەکان

لە بەشی یەکەمدا جەخت دەخەمە سەر ئامۆژگاری گشتی، کە دە ئامۆژگارییە، ئەم ئامۆژگارییانە وەکوو وتم ڕەنگە هەندێکیان ناڕاستەوخۆ بێت بۆ کێشەیەک لە کێشەکان، بەڵام من بەلامەوە گرنگ نییە کە ڕاستەوخۆ بێت، ئەوەی بە لامەوە گرنگ بێت ئەوەیە ئاڕاستەی خودی ئافرەتی بکەم، بە جۆرێک کە خودی خۆی هەستێت و ئامراز و ئامادەیی خۆی هەبێت بۆ تێپەڕاندنی کێشەکان، دواتر کارلێکردن لەگەڵ کێشەی تایبەت ئەوە بارودۆخی تایبەت بەخۆی هەیە.

هەڵەیەکی زۆر گەورەیە کە ئێمە گەلێک کێشەمان هەبێت و بە دوای چارەسەری تاکە کێشەیەکدا بگەڕێین، بۆ نموونە من کێشەیەکی دیاریکراوم هەیە و سەرچاوەکەی دەرەکییە، بۆیە دەگەڕێم بە دوای چارەسەرێکدا کە ڕووبەڕووی ئەم کێشە بەشەکییە ببمەوە، لەکاتێکدا کێشەکان کۆتاییان نایات، پێویستیش ئەوەیە کە توانام هەبێت ڕووبەڕووی کێشەی تر و کێشەی تر و کێشەی تر ببمەوە ... هیچ نەموەستێنێت، کێشە لە بوونی کێشەدا نییە، بەڵکوو کێشە لە نەبوونی توانایە بۆ تێپەڕاندنی کێشەکە و مرۆڤ بوەستێت.

## ئامۆژگارییەکان

**١ـ گرنگی و پێویستی چەسپاندنی یەقین دەربارەی بنچینەکانی ئیسلام و نەگۆڕەکانی و هەروەها جێگیرکردنی یاسا گەورەکانی ئیسلام لە دەرووندا**

ئەم پێشەکی و ئامۆژگارییە هەموو ئەوانەی دوای خۆی لەسەر بونیاد دەنرێت، هیچ پێویست نییە کە ئافرەت ڕووبەڕووی کێشەکان ببێتەوە لەکاتێکدا کێشەی لەم لایەنەوە هەبێت، سەرنج بدەن هەر ئامۆژگارییەک کە دەیکەم ڕاستەوخۆ هەوڵ بدەن ببینن ڕووبەڕووی کام یەک لە ئاڵنگارییەکان دەبێتەوە؟ بێگومان ئەم ئامۆژگارییە ڕوونە کە ڕووبەڕووی ئاڵنگارییە فکرییەکان دەبێتەوە بەتایبەتی، بەڵام ئەوانی تریش دەگرێتەوە. بەڵام بەشێوەیەکی سەرەکی لەبەر زۆری ئاڵنگارییە فکرییەکان، پێویستە کە بایەخێکی تایبەت بدرێت بە جێگیرکردنی یەقین و چەسپاندنی نەگۆڕەکانی ئیسلام لە دەروونەکاندا، چونکە ئەم کارە پانتاییەک لە دەروونتدا دیاری دەکات کە هێڵی سوورە و لەرزین پەسەند نەکات، ئەگەرچی گفتوگۆ، یاخود کاریگەربوون و شتی تریش ڕوو بدەن، هەرچەند کاریگەرببم بە گومانێکی جوزئی بەڵام هەمیشە ئاگاداری ئەوەم کە لە سنووری خۆی تێپەڕ نەکات.

**٢ـ جێگیرکردنی مەبەست و ئامانجە گەورەکان لە ژیانی مرۆڤی موسڵماندا، بە جۆرێک بەردەوام لێیان بڕوانێت و بێئاگا نەبێت دەربارەیان**

جێگیرکردن و ڕوانین پێکەوە، بابەتەکە ئەوە نییە کە تەنیا جارێک لە ئامانجەکانم بڕوانم، بەڵکوو دەبێت مەبدەئی ڕوانین ڕەگ دابکوتێت لەلام و دووبارە و دووبارە لێی بڕوانم ـنەک بە مەبەستی پێداچوونەوە و ڕاستکردنەوەـ بەڵکوو بە واتای دووبارە سەربەرزکردنەوە و ڕوانین لە مەبەست و ئامانجە

گەورەکان کە لەپێناویدا دروستکراوم، لەوانەش: بەدەستهێنانی بەندایەتی بۆ خودا، ڕزگاربوون لە سزای خودا، بردنەوەی ڕازیبوونی خودا، هەروەها ئەو ئامانجانەیشی کە دەتگەیەنن بەو مەبەستانە.

ئەم بابەتە بابەتێکی تەواوکاری نییە، بەڵکوو بابەتێکی سەرەکییە بۆئەوەی بە پتەوی ڕووبەڕووی ئاڵنگارییەکان ببیتەوە. ڕووبەڕووی هەموو ئاڵنگارییەکان دەبێتەوە، بەڵام لە دیارترین ئاڵنگارییەکان کە پێویستت بەم بابەتە دەبێت تێیدا: ئاڵنگارییە کۆمەڵایەتییەکانە، چونکە بە بەراورد بە مرۆڤە دونیاییەکان کە پانتاییەکی تەنگیان هەیە و لەپێناویدا دەژین، من پانتاییەکی فراوانترم هەیە لەو پانتاییە.

دواتر بابەتێکی گرنگ هەیە؛ من بوونەوەرێکی زیندووی مرۆڤم، لە چوارچێوەی ئەو ملیارەها بوونەوەرە زیندووە مرۆڤەی کە بە زەویدا تێپەڕ بوونە، هەروەها منیش ئەم زەوییە بەجێ دەهێڵم هەروەکوو چۆن جگە لەمنیش بەجێیان هێشتووە، بەدڵنیایی من بۆ هەتاهەتایی تێیدا نابم، ڕۆژێک دێت لەم ژیانەدا بوونم نامێنێت، ئەمە قۆناغی تێپەڕینە، قۆناغێکی کاتییە ... ئەم قۆناغە کاتییە: هەروەک چۆن دەژیم بە هەمان شێوە کەسانی پێش منیش وەها ژیاون، هەروەک چۆن من لە ئاواتدا دەژیم، بە هەمان شێوە ئەوانەی پێش منیش وا بوون ... هیوا و ئاواتەکانت کە دەتەوێت گەردوون ببەزێنێت و پێت وایە دەبێت دونیا هەمووی ئاوڕ بە لای هیوا و ئاواتەکانت بداتەوە، هەمان ئەو هیوا و ئاواتانەیە کە ملیارەها خەڵکی هەیان بووە و بەسەر ئەم هەسارەیەدا تێپەڕیون، بەتایبەتی ئەگەر ئەوانەی وتمان لە چوارچێوەی کێشە و هیوا و ئاواتە مرۆڤایەتییە باوەکان بێت، وەکوو: هاوسەرگیری، سامان، پیشە و ... تاد.

ئەم بابەتانە هەموو شتێک نین لە بووندا، نابێت وەها مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت کە بوونم بەندە بەوانەوە، ئەوانە داخوازییەکانی ژیانمن کە دەبێت کۆششیان بۆ بکەم، ئەوانەن کە ئاوڕم لێیان داوەتەوە، دەمەوێت ژیانێکی بەڕێزانە و خۆش بژیم، هۆکارەکان دەگرمە بەر ... بەڵام هەموو ئەمانە لە پانتاییەکی دیاریکراو دایە، کە ئەگەر تێیدا دۆڕام، هەموو شتم لەدەست نەداوە، شتگەلێکی باڵاتر لەوانە هەیە کە دەبێت لێیان بڕوانم، تەنانەت باڵاترە لەوەی کە پێویستە سەیری بکەم، بەڵکوو تەنانەت خودی ئەو شتەیە کە بۆی دروست کراوم، من دروستنەکراوم لەپێناو ئەو ژینگە کۆمەڵایەتییەی کە تێیدام.

بێگومان ئەم قسەیە ئاسانە، بەڵام جێبەجێکردنی زۆر قورسە، هەربۆیە من وتم: «جێگیرکردن و ڕوانینی بەردەوام».

٣ـ دەست بگرە بە سەرچاوەیەکەوە، بۆ بێنیازبوونی دڵ و ڕۆحت

ئەمە زۆرجار لە بابەتە دونیاییەکاندا پێشنیار دەکرێت: ڕژدی بکە لەوەی شتێکت هەبێت بێنیازت بکات لە ماددە، زۆر جار ئافرەتێک دەبینیت ساڵانێکی دوورودرێژ دەخوێنێت و ماوەی چەندین ساڵ گەشت دەکات بۆ شوێنی دوور، لەپێناو چیدا؟ بۆ بێنیازبوونی لە ژیانی ماددیدا. بێگومان ئافرەتانێک هەن کە کۆشش دەکەن لەپێناو پرسێکی زانستی، یاخود بەدەستهێنانی شتێک، کە ئەمە کێشەی تێدا نییە بە ڕێسا و مەرجی خۆیەوە، بەڵام هەندێک جار ئافرەت هەموو تەمەنی خۆی و گەنجێتی خۆی بەخت دەکات بۆ ئەوەی دونیای ماددی دەست بکەوێت و بێنیاز ببێت، کە هەندێک جار بەو هۆیەوە زۆر دەرفەتی ژیان و بابەتی کۆمەڵایەتی لەدەست دەچێت.

کەواتە مەبەست لەوەدایە کە مرۆڤ هەوڵی ئاسوودەبوون و بێنیازبوونی دڵ

و ڕۆحی بدات، لە ڕێگەی دەستگرتن بەسەرچاوەیەکەوە کە هەمیشە وەهای لێ بکات بۆ دوور بڕوانێت و خۆی لە هەوڵ و کۆشش بۆ ژیانی ماددی نەفەوتێنێت.

ئەم دوو ئایەتەش دەکرێت دروشمێک بێت بۆ ئەو قسانەی کە کردمان: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَاكَ سَبْعًا مِنَ الْمَثَانِي وَالْقُرْآنَ الْعَظِيمَ ﴿٨٧﴾ لَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِ أَزْوَاجًا مِنْهُمْ﴾ [الحجر: ٨٧ -٨٨] واتا: «سوێند بێت ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئێمە حەوت ئایەتمان پێ داویت (کە بریتی یە لە سوورەتی فاتیحە) هەروەها قورئانی گەورە و مەزنیشمان پێ بەخشیویت. جا تۆ چاو مەبڕە ئەوانەی بە بەشێک لە نازونیعمەتی دونیا بەهرەوەرمان کردوون.» هەروەکوو زانایانیش دەڵێن ئەم ئایەتە: ﴿وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِ أَزْوَاجًا مِنْهُمْ﴾ [طه: ١٣١] واتا: «جا تۆ چاو مەبڕە ئەوانەی بە بەشێک لە نازونیعمەتی دونیا بەهرەوەرمان کردوون.» فەرمانێکە دوای بێنیازبوونی بە قورئان هاتووە، هەربۆیە بوونی ئەم سەرچاوەیە (قورئان) سەرچاوەت بێنیازبوونتە و وات لێ دەکات بێنیاز بیت لەو شتانەی کە بێبڕوایانی پێ بەهەرەمەند بووە.

هەربۆیە بێنیازبوونی دڵ و ڕۆح، ئافرەت بەرز دەکاتەوە، زۆربەی ئەو پێویستییانەی بۆ پڕ دەکاتەوە کە وا گومانی دەبرد دەبێت لەپێناویدا زۆر بوار بگەڕێت، کەواتە گرنگە ئاوڕ لەم لایەنە بداتەوە، بەتایبەت نووری وەحی.

## ٤ـ گرنگی چاندنی پێناسەی دروستی سەرکەوتن و شکست و هەروەها وەلانانی گرێی کامڵبوون

کە ئەمە ڕووبەڕووی زۆربەی ئاڵنگارییە دەروونییەکان دەبێتەوە و هەروەها دامەزراویشت دەکات لەبەرانبەر ئاڵنگارییە بانگەوازی و چاکسازییەکان،

ئاڵنگاری دامەزراوەیی و خۆڕاگری، ئاڵنگاری کۆمەڵایەتی.سەرکەوتن و شکست، کامڵبوون و کامڵنەبوون، پێویستە بزانیت تۆ بوونەوەرێکی زیندووی لاوازیت، نوقسانیت هەیە، بوونەوەرێکی کە زۆر هەڵە دەکەیت، بوونەوەرێکی کە پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی فەرموویەتی: «**أيها الناس، إنكم لن تطيقوا - أو لن تفعلوا - كل ما أمرتم به، ولكن سددوا وأبشروا**» [سەحیح سونەن ئەبو داود: ١٠٩٦] واتا: «ئەی خەڵکینە! ئێوە هەموو ئەوەی من هێناومە ناتوانن جێبەجێی بکەن و لەت واناتاندا نییە، بۆیە هەوڵ بدەن لەو کارانەی دەیکەن بیپێکن و نزیک بن لە مەبەست و موژدە بدەن.» هەروەها فەرموویەتی: «**سددوا وقاربوا وأبشروا، فإنه لن يدخل الجنة أحدا عمله.» قالوا: ولا أنت يا رسول الله؟ قال: «ولا أنا، إلا أن يتغمدني الله منه برحمة**» [مسلم: ٢٨١٨] واتا: «هیچ کەس لە ئێوە بە کردەوەی خۆی ناچێتە بەهەشتەوە! وتیان: تۆش ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ)؟ فەرمووی: تەنانەت منیش! مەگەر خودا بە ڕەحمەتی خۆیم لەگەڵدا بکات.»

هەربۆیە وەها لەخۆت مەڕوانە کە دەبێت سەرکەوتوو و کامڵ بیت، هەروەها بۆئەوەی سەرکەوتوو بیت نابێت هیچ جارێک نەدۆڕێیت، بۆئەوەی سەرکەوتوو بیت نابێت بە هیچ ئەزموونێکی شکستخواردوودا تێپەڕببیت، بەڕاستی ئەمە شکستییە لەپێناسەکردنی سەرکەوتن.

ئەوە پەسەند بکە کە تۆ بوونەوەرێکی لاوازیت، پەسەندی بکە کە تۆ لە هەندێک ئەزموونەدا شکست دەهێنیت، پێناسەی سەرکەوتن و شکست دووبارە بکەوە، بۆ نموونە یەکێک لە شێوەکانی ئاڵنگاریی لەم سەردەمەدا، ئاڵنگاری بانگەواز و چاکسازییە، چوویتەتە نێو خول، یاخود پەڕتووکت خوێندووەتەوە، یاخود چوویتەتە نێو پرۆژەیەکەوە وای دابنێین پرۆژەی بانگەوازییە و شت فێربوویتە، ئافرەتێکی و فێربوویتە و دەتەوێت ئەم زانستە جێبەجێ بکەیت ...

هەر بەو بۆنەیەوە وەکوو باسمان کرد یەکێک لە دیارترین ئاڵنگارییە بانگەوازی و چاکسازییەکان؛ ئاڵنگاری بێتواناییە لە جێبەجێکردندا، من فێردەبم و فێردەبم، کەچی نازانم چۆن لە ڕووی بانگەوازی و چاکسازییەوە جێبەجێی بکەم، با وای دابنێین ئافرەتێکیت و فێربوویت و ئێستا توانا و ئەهلییەتی ئەوەت هەبوو لە ڕووی بنچینەوە و دەتەوێت جێبەجێی بکەیت، لە پڕۆژەیەکدا کارت کرد و شکستت هێنا لە ڕووی ئەوەی ئەو ئامانجانە دیاریکراوانەی کە داتنابوو، نەهاتنەدی.

ئەو پرسیارەی لێرەوە دروست دەبێت ئەمەیە:

- چی ڕوویدا؟!

- بۆچی، دەکرێت ڕاست بکرێتەوە؟

ئەی ئافرەتە موسڵمانەکان! بابەتی ئەوەی سەرقاڵ نابم لە پڕۆژەیەکدا، یاخود کارێکدا و نامەوێت کاریگەریم هەبێت سەرەتا هەوڵ دەدەم، چونکە دەترسم سەرکەوتن بە شێوەی خۆی بەدەست نەهێنم، ئەمە لە گەورەترین کۆسپەکانە، کە دەکرێت لە ڕێگەی بەرەو بالابوون، بتوەستێنێت.

پێناسەی سەرکەوتن و شکست دووبارە دەکەمەوە، لە گەورەترین سەرکەوتنەکان کە دەکرێت بەدەست بهێنرێت: دامەزراوەییە لەسەر بنەماکان، هاوتایی هەق و کارکردن پێی و دامەزراوەیی لەسەری، دواتر ئەنجام بەدەست بێت یاخود بەدەست نەیەت ئەوە شتێکی ترە، باوەڕدار پێویستە لەسەری کە هەوڵ بدات.

**٥ـ سەرقاڵبوون بە پڕۆژەیەکی کردەیی کە تێیدا خەم و فکر و ڕۆحی تێدا بتوێتەوە ـ پڕۆژەیەکی پەیامدارـ**

بوونی پرۆژەیەک لەلای مرۆڤ، گەورەترین شتە کە بەهۆیەوە کێشە و ئاڵنگارییەکان تێپەڕێنێت، ئەگەر خودی خۆت پرۆژەت نەبێت، هەوڵ بدە بەشێک بیت لە پرۆژەیەک، مەرج نییە کە پرۆژەکە شتێکی گەورە بێت، جارێکی تر دووبارەی دەکەمەوە: لە گرنگترین ئەو شتانەی کە ئافرەت بتوانێت بەهۆیەوە ڕووبەڕووی ئاڵنگارییەکان ببێتەوە، بوونی پرۆژەیەکی پەیامدارە، بێگومان ئەمەش تایبەت نییە بە ئافرەت، پرۆژە جیاوازە لە چالاکی؛ تایبەتمەندی پرۆژە ئەوەیە بەردەوام لە پێشەوەی خۆت دەڕوانیت، وزەکانی خۆت بەکاردەهێنیت تا دەگەیت بە ئامانج.

٦ـ پێکهێنانی ژینگەیەکی چاکەکاری دیاریکراو

ئاگادارکردنەوە: بە مەبدەئی کامڵی مامەڵە لەگەڵ ئەم ژینگەیەدا مەکە، ئەگەر خودای گەورە لە شوێنێک داینایت کە ئافرەتی تری تێدا بوو، ئەوەی گرنگ بێت بەلایانەوە خۆشەویستی خودا و پێغەمبەر (ﷺ) بێت، گرنگە بەلایانەوە کە شتێک ئەگەر کەمیش بێت پێشکەشی بکەن، خەڵکی فێر بکەن و فێر ببن و هەوڵ بدەن ... کە بەم شێوەیە بن، دەسا ئیتر مرۆڤ چاو لە هەندێک هەڵە و کێشە و نوقسانی بپۆشێت.

چاوپۆشین بە واتای ڕازیبوون بە هەڵە نایەت، بەڵام هەوڵدەدات بە دانایی چاکی بکات، ئامۆژگارییەک و قسەیەک لەو ... ئەگەر چاک نەبوو با لێی بگەڕێت ﴿إِنْ عَلَيْكَ إِلَّا الْبَلَاغُ﴾ [الشورى: ٤٨]. واتا: «تۆ هەر گەیاندن و ڕوونکردنەوەت لەسەرە»، وا خەیاڵ مەکە کە ژینگەیەکی دیاریکراو و چاکەکار دەبێت خاڵی بێت لە هەر کێشە و نوقسانییەک، دەروونی مرۆڤ کەمکەم پاک دەبێتەوە، ئەبووزەڕ دوای ساڵانێک لە ئیسلامەتی بە هاوەڵێکی

وت: «ئەی کوڕی ئافرەتە ڕەشەکە!»[1] پێغەمبەریش (ﷺ) پێی فەرموو: «تۆ کەسێکی کە هێشتا تایبەتمەندی سەردەمی نەفامیت تێداماوە.» وتی: «لەم ساتەشدا کە لە گەورەیی تەمەنم دام؟» ئەبوو زەڕ لە موسڵمانە پێشینەکانیش بوو، بێگومان لەدوای ئەم مەوقیفەوە ژیانی ئەبوو زەڕ بەتەواوەتی لەو ڕووەوە گۆڕا، هەربۆیە ژینگەیەکی چاکەکار زۆر گرنگە، گرنگە کە مرۆڤ هەوڵ بدات ژینگەیەکی چاکەکاری هەبێت و دەستی پێوە بگرێت و هەروەها داوای کامڵی نەکات بەڵکوو هاوسەنگی لەنێوان چاکە و خراپەدا ڕابگرێت، هەوڵی کەمەندکێشکردنی دڵەکان بۆ لای یەک و یەکبوونی وشەکان و دامەزراوەیی بارودۆخیان بدات، ئیتر دوای ئەوە مرۆڤەکە هەر جیاوازییان دەبێت.

**٧- ڕاهێنانی دەروون لەسەر بەردەوامی و ئارامگری و کۆشش و کۆڵنەدان، داماڵینی پێوەندەکانی ستەم و گلەیی و بێزاریی**

هەندێک لە ئاڵنگارییە کۆمەڵایەتی و دەروونی و چاکسازی و دامەزراوەیی و خۆڕاگرییەکان پێویستە کە ئارامگری و کۆششت هەبێت، چونکە هیچ کەس تۆ ڕزگار ناکات، چاوەڕوانی کەس مەکە! مرۆڤ بەرپرسە لە دەروونی خۆی، تۆ ئافرەتێکی موسڵمانی ڕاسپێردراوی، خودا ئەم ئایینەی دابەزاندووە کە فەرمانی بۆ تۆ و جگە لە تۆش تێدایە، تۆ وەکوو خودی خۆت داوات لێ کراوە، خودا دەفەرمووێت: ﴿وَكُلَّ إِنْسَانٍ أَلْزَمْنَاهُ طَائِرَهُ فِي عُنُقِهِ ۖ وَنُخْرِجُ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كِتَابًا يَلْقَاهُ مَنْشُورًا ﴿١٣﴾﴾ [الإسراء: ١٣] واتا: «نامەی کردەوەی هەر کەسێکیشمان هەڵواسیوە بە گەردنیدا و لە ڕۆژی دوایدا کارنامەی کردەوەکانی بۆ دەردەهێنین و بە کراوەیی دەخەینە بەردەستی (ئاشکرایە کە ئەو دەزگایانەی کار و کردەوەی ئێمەی لەسەر تۆمار دەکرێت زۆر پێشکەوتوو

---

(١) پێشەوا موسلیم گێڕاویەتییەوە بە ژمارە (١٦٦١)

ترە لەوەی کە ئادەمیزاد تا ئێستا پەی پێ بردووە).»

ئەم گەواهییەش پێمان دەڵێت کە پێویست و گرنگە مرۆڤ دەروونی لەسەر ئارامگری و کۆشش و بەردەوامی ڕابهێنێت و واز بهێنێت لە گلەیی و بێزاریی و کۆڵدان.

## ٨ـ کردنی ئافرەتانی چاکەکار بە پێشەوای خۆت

زۆر گرنگە ئافرەتی باوەڕدار بەگشتی، بەدیاریکراوی لەم سەردەمەدا کە سەردەمێکە تێیدا هەڵگەڕانەوە و شەپۆلەکان تێیدا زۆرن لە نموونەکان بڕوانێت، خەڵکی پێویستی بە ڕوانینی نموونەی چاکەکارەکانە، لە گرنگترین بابەتی نموونەکانیش بوونی پێشەوایە، هەوڵ بدە کە پێشەوایەکی چاکەکارت هەبێت، کە لێیەوە لە ڕووی کرداری و زانستییەوە سوودی لێ وەربگریت، ئەم پێشەوایە دەکرێت لە پیاوان بێت و دەکرێت لە ئافرەتانیش بێت، دەکرێت لە مێژوو دابێت و دەکرێت لە واقعی ئەمڕۆدا بێت، بەڵام من پێم وایە لە بابەتی پێشەوادا، پێشەوایەکت لە مێژوو و پێشەوایەکت لە واقعدا هەبێت، هەروەها بەشێوەیەکی دادگەرانە لە پێشەواکەت بڕوانە، وەها لێی مەڕوانە کە بێ‌هەڵە بێت، هەروەها لە هەمان کاتدا دەبێت چەند دیاردە و خوویەکی گشتی لەم پێشەوایەدا هەبن.

بۆیە من پێم وایە کە بەشێکی چارەسەری کێشەکان بوونی نموونە و پێشەوایەکە، ئەم نموونەیە کە تۆ وەکوو ئافرەتێک بیر لە چیرۆکی خەدیجە و سومەییە و ئوم سولەیم و ئوم حەڕام و ئوم عەممارە دەکەیتەوە کاریگەری دەبێت لەسەرت، خۆ ئەگەر نموونەی هاوچەرخت بینی ئەمەش کاریگەری دەبێت، هەروەها پێویستیش نییە کە پێشەواکە کەسێکی ناودار بێت، دەکرێت ئافرەتێک بێت، یان گەنجێک بێت لە بوارێکی زانستیدا لەگەڵت بێت، هەروەها

دەکرێت لاساییکردنەوە و بە پێشەوا گرتنەکە لە هەندێک شتی جوزئیدا بێت و پێویست نییە لە هەموو شتێکدا بێت. ئەمەش ئاگادارمان دەکاتەوە لە پێویستی بایەخدان بە دروستکردنی نموونەی ئافرەتی چاکەکار کە ببن بە نموونەیەک بۆ کچانی دیکە، هەروەها ئەم باسەمان پشتگیرییە بۆ ئەو خاڵەی کە وتمان چارەسەرکردنی ئەو کێشە و ئاڵنگارییانەی ڕووبەڕووی ئافرەت دەبێتەوە، نابێت بەشێوەی تاک سەیر بکرێت، بەڵکوو دەبێت بەشێوەی تەواوکاری سەیر بکرێت، کە چارەسەرمان بۆ بەشێک لە کێشەیەک، چارەسەرە بۆ بەشەکانی تری کێشەکە، هەربۆیە یەکێک لە گرنگترین شتەکان کە کێشەکانی ئافرەت چارە دەکات بەشێوەیەکی گشتی بوونی پێشەوایە، کە ئەم کێشە چارەسەر دەکەیت بۆئەوەی کاریگەری هەبێت لە چارەسەری کێشەکانی تردا.

**٩ـ گرنگی زانینی ماف و بەرپرسیارییەتییەکان بە نیسبەت ئافرەتەوە، هەروەها ڕێنموونی بوون بە ڕێنموونی پێغەمبەری (ﷺ) لە دیاریکردنی مەشخەڵەکانی ئەم ماف و ئەرکانە، دواتر کارکردن لەژێر ڕۆشناییاندا**

مافگەلێک هەن، ئەم مافانە ئەگەر تۆ ڕاسپێردراو بیت پێی، ئەوا گرنگە ڕوونی بکەیتەوە بۆ کەسێک کە ڕێگری ئەم مافانەت لێ دەکات، لەکاتێکدا تۆ ڕاسپێردراوی پێی، هەروەها زۆر گرنگە کە ڕوون بیت لەکاتی ڕوونکردنەوەکەدا، بەڵام گرنگە کە ئەم مافانە مافێکی شەرعی و ئیسلامی بن. ئەگەر کەسێک پێت بڵێت: «تۆ چیت داوە لەم بابەتە؟» ئەمە ڕێگرییەکە لە مافی تۆ، ئەم مافە تۆ دەبێت لەسەری بێیتە قسە و قسەی ڕوونی تێدا بکەیت.

ئەوەی لەسەر ئەم باسە هاتبێت لە شەرعا ئەو فەرموودەی پێغەمبەرە (ﷺ)

كە دەفەرمووێت: «لا تمنعوا إماء الله مساجد الله» [مسلم: ٤٤٢] واتا: «ڕێگری ماڵەكانی خودا لە ئافرەت مەكەن!» لە ڕیوایەتێكی تردا: «لا تمنعوا النساء حظوظهن من المساجد إذا استأذنوكم» [مسلم: ٤٤٢] واتا: «ئەگەر ئافرەتێكتان داوای چوون بۆ مزگەوتی كرد، ڕێگری لێ مەكەن.» ڕێگەی زانینی ئەم مافەش خودی شەرعە، بۆیە باشتر وایە زانیارییەكی پێشینە هەبێت، دواتر داوای ماف بكرێت ئەگەر ڕێگری لێ بكرێت، داواكردنەكەش بەڕوونی و كراوەیی داوا بكرێت، نەک بە یاخیبوون و ئاژاوەگێڕی، تۆ كە باوكی، یان دایک، یاخود مێرد خودای گەورە ئێمەی هەموو خستووەتە ئەم ژیانەوە و شتێكی داناوە ئێمە حوكم بگێڕینەوە بۆ لای، باڵاترە لە هەموومان. شەریعەت داوای لە من كردووە فڵانە شت بكەم، خودا وای داناوە كە من وا بكەم، پێغەمبەر (ﷺ) وای داناوە كە من فڵانە شت بكەم، ئێوەش لەسەر سەر و چاوم بەڵام ئەمە بابەتێكە تكاتان لێ دەكەم دەستی لێ مەدەن!

بێگومان ئەمە بە هاوسەنگی، ئەم بابەتە پێویستی بە تێگەیشتنێكی باش هەیە، لەڕێی شتی دیكەوە هەوڵ مەدە شتانێكی تر بەدەست بهێنیت، شەریعەت بە هەندێک هاوسەنگی ڕاگیركەرەوە هاتووە. بۆ نموونە ڕۆژووی سوننەت بە نیسبەت ئافرەتەوە دەبێت ئیللا مێردەكەی ڕێگەی پێ بدات، ئەمەش لەو هاوسەنگییانەیە كە باسمان كرد. بۆیە بەشێک لەو مافانەی لەدەست دەچێت، یان لەبەر ئەوەیە ئافرەت زانیاری نییە دەربارەیان، یاخود دەیزانێت بەڵام داوای ناكات، باشە، ئەگەر زانیت و داوات كرد چ شتێک دەبێت؟ مرۆڤی وەها هەیە كە ئامرازی گونجاو دەگرێتە بەر، هەندێک جار وازنەهێنان و بەهێزی لەكاتی قسەكردندا چارەسەرە، هەندێک جاریش دڵڕاگرتن و ڕووبازی چارەسەرە بە گوێرەی جێگە و ڕێگەكە، بۆ نموونە هەندێک جار هاوڕێكانت گاڵتەت پێ

دەکەن، لەم شوێنانەدا باشتر وایە ڕاشکاو و بەهێز بیت لە قسەکردنا، نەک لاواز و گرینۆک و بێتاقەتی. هەربۆیە مرۆڤ لە هەندێک بابەت دەبێت ڕاشکاو و بەهێز بێت، ڕێگە نەدات بە گاڵتەکردن، بەتایبەتی گاڵتەکردنی هەندێک بە حیجاب بۆ نموونە. لە هەمان کاتدا بوونی زانیاری دەربارەی بەرپرسیارییەتییەکان، لەبەرئەوەی هەندێک ئافرەت جگە لە مافەکان زانیارییان دەربارەی هیچ نییە، دواتر لە پانتاییی مافەکاندا سنووردار دەبێت و ڕازی نابێت هیچ کەس داوای بەرپرسیارییەتی لێ بکات.

هەر وەک چۆن مافت هەیە بە هەمان شێوە بەرپرسیارییەتی و ئەرکیشت لەسەرە، هاوسەنگی ڕاگرتن لەنێوانیاندا زۆر زۆر گرنگە لە چارەسەرکردنی زۆربەی ئاڵنگاری و کێشەکان.

**١٠- پاڵپشتی وەرگرتن لە کردەوە و زانست بە شێوازی قورئانی و پێغەمبەری (ﷺ)، ژیانن**

کردەوەیەک کە بونیادنرابێت لەسەر زانست و زانستێک سەر بکێشێت بۆ کردەوە، ئەمە شێوازی پێناسەی مرۆڤە لە بووندا، من بوونم هەیە لەبەر ئەمە، لەولا قسەمان لەسەر جێگیرکردنی نەگۆڕەکان و ئامانجەکان کرد، لێرەدا قسە لەسەر شێوەی ڕۆژانەی ژیانی مرۆڤ دەکەین، کە شێوەگەلێکی زۆر لەخۆ دەگرێت بەڵام هەمووی کورت دەبێتەوە لە بابەتی زانست و کردەوە. هەربۆیە زۆر گرنگە گەورەترین بنەماکانی ژیانم کە لەپێناویدا دەژیم ئەوە بێت فێری ئەو شتەبم کە خودا لێمی دەوێت، هەروەها کار بکەم بەو شێوەیەی کە خودا لێمی دەوێت.

جوڵێنەری هەقیقی مرۆڤ تێکەڵکردنی زانست و کردەوەیە پێکەوە، هەر

کاتێک ژیانم پڕ بوو لە زانست و کردەوە، زانست بە خودا و پەڕتووکەکەی و سوننەتی پێغەمبەرەکەی (ﷺ)، هەروەها ئەنجامدانی کردەوە لەژێر ڕۆشناییان، ئەوا ژیان ڕەنگ دەبێت بە زۆر وێنەی چاکەکاری کە ڕێز و شکۆ بۆ مرۆڤ بەدی دەهێنن.

## بەرچاوڕوونییەک لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئاڵنگاری فیمینیزم

ڕووبەڕووبوونەوەی ئالنگارییە فکرییەکان هەمیشە نە ڕووی فکری بە تەنیا یاخود لە ڕووی زانیارییەوە نابێت، بەڵکوو پێویستمان لەگەڵیدا بە ڕێگەیەکی دیکەش هەیە، ئەویش دەرهێنانییەتی لەم زۆنگاوەدا، چاڵ ئەو شوێنەیە کە ئەم فکرانەی لێوە دێت، ئەو شوێنەی کە وا لە ئافرەت دەکات قابیلییەتی کاریگەربوونی بەم فکرانە هەبێت.

ئەگەر ئافرەت بفرێت بۆ ئاسمان، ئامانجەکانی ڕوون بێت، خاڵی دەستپێک و کۆتایی ڕوون بێت، گرنگترین مەبەستەکانی بەدەستهێنانی بەندایەتی خودا بێت، بێنیازبوونی دڵ و ڕۆحی هەبێت لەڕێی قورئان و سرووشەوە، ژیانێکی شکۆدار و بەڕێزانە بژییەت لە دەروونیدا، ژیانێکی خۆش بژییەت، ئافرەتێک بێت هاوسەنگی لەنێوان زانست و کردەوە ڕابگرێت، مافی خودا و مافەکانی تر بدات، بەرپرسیارییەتی لە ماڵ و دەرەوەدا هەبێت، دوای ئەوە بە کۆمەڵێک گومانی فیمینیزمەوە بۆی بێن، هەرگیز ئاوڕی بۆ ناداتەوە، هەر بە هیچی دانانێت مەگەر بە کۆمەڵێک ئەفسانە یاخود شتانێک کە لەو ئاسمانە بەرزەوە بیهێننە خوارەوە بۆ ناو چاڵێکی تاریک. بەبێ بوونی ئەمانەش، نەبوونی زانیاری کە لایەنی عەقڵی پڕ بکاتەوە و هەروەها نەبوونی ئاسوودەیی کە

لایەنی ڕۆحی پڕ بکاتەوە، هەروەها نەبوونی ئامانج و مەبەستی بەرز، دەبنە هۆی کاریگەربوونی بەم گومانانە، کە لەبری ئەوەی لە ئاسمانەکاندا بفڕێت، ژیانی لە چاڵێکی تاریکدا دەبێت.

## گێڕانەوەی ڕۆڵی ئافرەتی موسڵمان

لەم بابەتەدا باسی گێڕانەوەی ڕۆڵی ئافرەتی موسڵمان دەکەین و قسەکردنیش دەربارەی گەڕانێکی مێژووی دوورودرێژ لەخۆ دەگرێت و هەوڵیش دەدەم کە خۆم دوور بگرم لەو نموونانەی کە پێشوتر باسم کردن، لە باسەکانی پێشوودا دەیان نموونەمان هێنایەوە، بۆیە کاتێک باسی گێڕانەوەی ڕۆڵی ئافرەت دەکەین ڕەنگە ڕاستەوخۆ یەکەمین نموونەیەک بێتە خەیاڵەوە، ئەو نموونانە بێت کە پێشوتر باسمان لێوە کردن، وەکوو: خەدیجە، عائیشە (ڕەزای خودایان لەسەر بێت.)، ئوم سولەیم، ئوم حەڕام و ... تاد. بەڵام لەم بابەتە خۆم بە دوور دەگرم لە باسکردنی ئەو نموونانەی پێشووتر، چ لە هاوەڵان، یاخود ئەوانەی دواتر هاتن لە شوێنکەوتوان، هەر بۆیە ڕەنگە نزیکەی بیست گەواهی و نموونە باس بکەم کە تەنیا یەک، یان دوو دانەیان دووبارە بێت لەوانەی پێشووتر کە باسمان لێوە کردن، کاتێک باسی نموونەی تازەش دەکەین سوودەکەی ئەوەیە کە نەوترێت ئەم بابەتە تایبەتە بە چەند نموونەیەک و تەنیا قسەکردن بووە لەسەر چەند بارودۆخێکی دەگمەن. نا، نەخێر، من لەم لایەنەوە قسە ناکەم، بەڵکوو لەو ڕووەوە قسە دەکەم کە ئاخۆ ئافرەت دەتوانێت چی بکات، یان ئایا ئەو بارودۆخانەی کە ئافرەت ڕۆڵێکی چالاکی تێدا دەبینی تەنیا چەند بارودۆخێکی دیاریکراو بوو، یاخود نموونە و گەواهی دووبارەبووەن و بەشێوەیەکی بەرچاو بوونیان هەیە؟

چەند پێشەکییەک دەربارەی ئەم بابەتە:

پێشەکی یەکەم: ئەم ڕۆڵانەی کە قسەی لەسەر دەکەین بەهۆی پاڵەپەستۆی ئەو واقیعەوە نەبووە کە تێیداین، بەڵکوو ئەم ڕۆڵانەمان لە دەقەکانی سرووش هەڵهێنجاوە و گەواهی و نموونەشمان لەبارەیەوە هەیە لە مێژوودا.

واتا کاتێک باس لە گێڕانەوەی ڕۆڵی ئافرەت دەکەین سەرەتا نایەین بزانین ئەو واقعەی تێیداین لە چ لایەنێکەوە پاڵەپەستۆی دروست کردوە و ئێمەش بێین بڵێین پێویستە ئافرەت لەم لایەنەدا ڕۆڵی هەبێت و بەدوای گەواهی و نموونەیەکی مێژوویدا بگەڕێین بۆی. نەخێر، ئەمە نە پاڵنەرە، هەروەها نە جووڵێنەریشە بۆ باسکردنی ئەم بابەتە.

پێشەکی دووەم: هەر بەڕاستی ئەو واقعەی تێیداین پاڵەپەستۆ دەخاتە سەرمان دەربارەی ڕۆڵی ئافرەت لە ڕووی پێویستییەوە نەک لە ڕووی ئەوەی واقعەکە لەخۆی گرتووە، کاتێک قسە لەسەر ڕۆڵی ئافرەت دەکەین، ئەگەر کەسێک بڵێت: «ئایا ئێوە لە ژێر پاڵەپەستۆی واقعەکە ئەم باسە دەکەن؟» ئێمەش دەڵێین: «مەبەستت چییە؟ ئەگەر مەبەستەکەت ئەوە بێت کە ئێمە لەژێر پاڵەپەستۆی واقعەکە و لە ڕووی ناوەڕۆکەکەیەوە باس لە ڕۆڵی ئافرەت دەکەین وەکوو ملکەچییەک بۆ ئەم ڕۆشنبیرییەی کە لە واقعەکەدا بوونی هەیە، ئەوا نەخێر وانییە، بەڵام ئەگەر مەبەستەکەت ئەوە بێت کە لەژێر پاڵەپەستۆی واقعەکە لەو ڕووەی کە پێویستیمان بە گێڕانەوەی ڕۆڵی ئافرەتە، ئەوا بەڵێ.»

پێشەکی سێیەم: کاتێک قسە لەسەر گێڕانەوەی ڕۆڵی ئافرەت دەکەین، لەکاتی باسکردنی نموونە مێژووییەکان قسە لەسەر ئەوە ناکەین کە هەمان ڕۆڵی ئەو نموونە مێژووییانە بگێڕینەوە بە هەمان کار کە ئەنجامیان داوە و

قسە لەسەر کۆپیکردنی هەمان کاری ئەوان ناکەم لە چوارچێوەی ڕۆڵێکی دیاریکراودا، بەڵکوو قسە لەسەر گێڕانەوەی خودی واتای ڕۆڵەکە دەکەین نەک ئەو کارانەی کە هەر ڕۆڵێک لەخۆی دەگرێت.

بۆ وێنە زۆربەی ئەو نموونانەی کە باسیان دەکەین نموونەی ئافرەتە گێڕەرەوەکانن، بۆیە کاتێک دەڵێین ڕۆڵی ئافرەت دەگێڕینەوە مەبەستمان ئەوە نییە کە ڕۆڵی ئافرەت بەتەنیا لە زانستی فەرموودەزانی (واتا ئەو ئافرەتانەی فەرموودەیان گێڕاوەتەوە) بگێڕینەوە، بەڵکوو خودی واتاکە زاڵ و مەبەستدارە نەک کارە لاوەکییەکە.

پێشەکی چوارەم: زۆر گرنگە کە خوێندنەوەی نموونە مێژووییەکان خوێندنەوەیەکی شیکاری کۆگر و پێوەندار بێت بە مەبەستەکە، کۆگری کاریگەرییەکان بێت، هەربۆیە زۆر گرنگە کە خوێندنەوەی نموونەکان خوێندنەوەیەکی هوشیارانە و کۆگرانە بێت، نەک وەکوو خوێندنەوەی بەسەرهاتێک، بەڵکوو باشتر وایە کە شی بکرێتەوە و هەڵهێنجانی تێدا بکرێت کە بواری گەیشتن بەو پێگەیەی ئەوان شتێکە کە ئەگەری هەیە و دەکرێت.

# بوارەکانی ڕۆڵی ئافرەت و چەند نموونەیەك

لەم بابەتەدا باس لەو بوارانەی ڕۆڵی ئافرەت دەکەین کە لە ڕابردوودا بینیویەتی و هەوڵ دەدەین بۆ هەندێک لەو نموونانەی کە هەر یەکێک لەو بوارانە لەخۆی گرتووە، شیکردنەوەی بۆ بکەین و دواتر سوودی لێ وەربگرین لەو شتانەی کە پەیوەستە بە ڕۆڵی ئافرەت و گێڕانەوەی ڕۆڵی ئافرەت لە ئەمڕۆدا.

## بواری یەکەم: فەرموودەزانی

لەم بوارەدا نموونەی جۆراوجۆرمان زۆرە، بەشی یەکەمی نموونەکان کە باسی دەکەم، ناوێک دەهێنمەوە کە ئافرەت نییە و پیاوە، بەڵام پیاوانێک کە لە زانا گەورە و پێشەوا دیارەکانی ئەم ئوممەتەن و دەبینیت کە فەرموودەی لە فڵانە ئافرەت و فیسارە ئافرەتەوە وەرگرتووە، یاخود فەرموودەی بەسەر فڵانە ئافرەت خوێندووەتەوە، یاخود سوور بووە لەسەر ئەوەی گەشت بکات بۆ وڵاتێکی دیکە بۆ ئەوەی گوێ لە فەرموودەی فڵانە ئافرەت بگرێت، لە بەشی دووەمی نموونەکان باس لەوە دەکەین کە هەمان فڵانە ئافرەت کە فێرخواز، یاخود گێڕەرەوە بووە، دەبینیت کە لەنێو قوتابییەکانی ناوی زۆر گەورە پەیدا بوونە لە مێژوودا.

نموونەکان:

نموونەی یەکەم: پێشەوا «زەهەبی»یە کە خاوەنی پەڕتووکی (سیر أعلام النبلاء)یە و نووسەری زۆربەی ژیاننامەکانە، پێشەوا زەهەبی دەربارەی ئافرەتێک قسە دەکات بە ناوی ئوم موحەممەدی کچی موسای کوڕی عوسمان کە لە ساڵی ٦٩٥ی ه. کۆچی دوایی کردووە، پێشەوا زەهەبی دەڵێت: «گەشتم کرد بۆ ئەوەی بە دیداری بگەم و زانستی لەلا فێر ببم.» هەروەها دەڵێت: «ئاواتی گەیشتن بە دیداریم هەبوو و بۆیە گەشتم کرد بۆ میسر و بەپێی زانیاری خۆم وام دانابوو کە لە ژیاندا مابێت، بەڵام کە چوومە نێو میسر بۆ لای، هەواڵی مردنیم بیست کە وا دە ڕۆژ بوو کۆچی دوایی کردبوو.» کە «پێشەوا زەهەبی» ئەم بەسەرهات و ئاواتەی خۆی بۆ ئەوەی بە دیداری ئافرەتێک بگات لە پەڕتووکەکەی خۆیدا کە گەورەترین پەڕتووکی مێژووە کە زانایان دەربارەی توراس نووسیویانە: «پێشەوا زەهەبی تامەزرۆی ئەوە بوو گەشت بکات بۆ میسر بۆئەوەی بە دیداری ئەم ئافرەتە گێڕەرەوەیە بگات و لێیەوە فەرموودە ببیستێت، بەڵام پێش ئەوەی بگات، مردبوو.»

ئێستاش شیکردنەوە بۆ ئەم بەسەرهاتە دەکەم بەم شێوەیە: ئەم ئافرەتە شتێکی لە لابوو کە شایستەی ئەوەی کردبوو کە پێشەوا «زەهەبی» گەشت بکات بۆ لای و حەسرەتی دیداری ئەوی هەبێت بۆ ئەوەی گوێ لە فەرموودانە بگرێت کە لەلای بوو، وەکوو ئەوەی بڵێیت ئەم ئافرەتە شتێکی لابێت کەسی دیکە لای نەبێت، هەر بۆیە پێشەوا «زەهەبی» پێویستی بەوە بوو گەشت بکات بۆ لای، کاتێک ئێمە باسی «زەهەبی» دەکەین باسی کەسێک دەکەین کە لە ڕووی ڕیوایەتەوە زۆر فراوان بوو.

نموونەی دووەم: «ئەبوو قاسم ئەل عەساکر»ە، «ئیبن عەساکر»یش هەروەها لە پێشەوایانی ڕیوایەت بوو لە مێژووی ئیسلامدا و خاوەنی پەڕتووکی (تاریخ

دمشق)ـە کە لە پەڕتووکە کەلەپوورییە گەورە و قەبەکانە و زۆر گرنگە و وەکوو پەڕتووکی (تاریخ بغداد)ی خەتیبی بەغدادی وەهایە، ئەم پێشەوایە «ئیبن عەساکر» فەرهەنگێکی هەیە ناوی ١٣٠٠ لە مامۆستاکانی خۆی تێدایە و لە خودی خۆیانەوە شتی بیستووە و فەرهەنگێکی بچووکیشی جیا کردووەتەوە بۆ مامۆستا ئافرەتەکانی کە ژمارەیان دەگاتە ٨٠ و ئەوەندە ئافرەت. ئەم پێشەوایە لە ساڵی ٥٧١ی هـ. کۆچی دوایی کردووە و خودی سوڵتان سەلاحەدینی ئەیووبی لە کاتی ناشتنیدا ئامادەیی هەبوو، سا بیرۆکەکە لەوەدایە کە پێشەوایەکی مەزنی بەم شێوەیە نزیکەی هەشتا و ئەوەندە لە مامۆستاکانی ئافرەت بوونە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئێمە قسە لەسەر بازنەیەکی فراوانتری بڵاوبوونەوە و بایەخدان بە ئافرەت دەکەین و بوونی هەشتا و ئەوەندە مامۆستای ئافرەت کە زانیارییان دەگواستەوە لە فەرمووده و سوننەت بۆ خەڵکی، ئەمە زۆر جار لەناکاوەوە ڕوو نادات، بەڵکوو دەرەنجامی بایەخدانی لە پێشینە و بوونی ناوەندێکی زانستی گونجاوە، بۆئەوەی ئەم جۆرە نموونانەی تێدا پەیدا ببن و ببنە مامۆستا بۆ پیاوان و پێشەوایانی ئەم ئوممەتە.

نموونەی سێیەم: پێشەوا «ئیبن قودامەی مەقدەسی»یە، ئەم پێشەوایە خاوەنی پەڕتووکی (المغني)یە و لە زانا خواویست و چاکەخوازە گەورەکانی ئەم ئوممەتەیە، ئەم پێشەوایە لە چەند مامۆستایەکی ئافرەتەوە گوێی لە فەرمووده بووە لەوانەش: خەدیجە نەهرەوانی، نەفیسە و شوهدە، هەروەها خۆیشی قوتابی ئافرەتی هەبووە لەوانە: زەینەبی کچی واسیتی.

نموونەی چوارەم: «شوهدەی کچی ئەبی نەسری دینوری»یە، پێشەوا «زەهەبی» دەربارەی دەڵێت موعەممەرە، نووسەر، موسنەدەی عێراقی، شانازی ئافرەتان، لە کۆمەڵێک فەرمووده‌ی بیستووە و هەندێک مامۆستای هەیە

کە دەربارەیان بیستوومانە، هەروەها مامۆستای هەیە کە بیستوومانە لێیەوە فەرموودەیان گێڕاوەتەوە (گەواهییەکە لێرە دایە، ئەوانەی لێیەوە فەرموودەیان گێڕاوەتەوە واتای ئەوەیە لە فەرموودە گێڕەرەوەکان بوونە، سا چەند کەس لێیەوە گێڕاویانەتەوە؟ دەبینیت خەڵکێکی زۆر لێیەوە گوێیان لە فەرموودە بووە، زۆر لەو ناوانەش پێیاندا تێپەڕ دەبیت نەت ناسیون، یاخود تایبەتمەندەکانی بواری فەرموودە دەیناسن، بەڵام ئێستا ئێمە تەنیا باسی ئەوانە دەکەین کە «زەهەبی» باسی کردوون لەوانەی کە لە «شوهدە»ی نووسەرەوە فەرموودەیان وەرگرتووە و کەسانی دیارن و لە هەمان کاتدا لەوەوە فەرموودەیان وەرگرتووە.) «ئیبن جەوزی» کە ناسراوە، دەڵێت: «شتم بەسەردا خوێندووەتەوە و خەتێکی جوانیشی هەبوو، تێکەڵی زانایان بوو، چاکەی زۆری هەبوو لە ساڵی ٥٧٤ی ك. کۆچی دوایی کرد و خەڵکێکی زۆر و عامەی زانایان ئامادەی ناشتنەکەی بوون.» ئەوەی جێگەی سەرنج بێت، ئەوەیە یەکەم موسنیدەی عێراق بووە، ئەمەش واتای ئەوە بەتەنیا گێڕەرەوەیەکی ئاسایی نەبووە بەڵکوو مەسندەی عێراق بووە، شتێکی دیکەش ئەوەیە کە: «ئیبن عەساکر، ئیبن جەوزی، ئیبن قودامە، عیماد و سەمعانی» هەموویان لێیەوە فەرموودەیان گێڕاوەتەوە و زانستیان لێ وەرگرتووە، لەبەر بەناوبانگی بوو بۆیە لە کاتی مردنیدا عامەی زانایان ئامادەی ناشتنەکەی بوون.

نموونەی پێنجەم: «ئەبوو وەلیدی تەیاڵسی»یە، ئەم پیاوە بەرێزە مامۆستای پێشەوا بوخاری بووە و هەمیشە بوخاری لە سەحیحەکەیدا لێیەوە فەرموودەی گێڕاوەتەوە، سا قسەکە لێرەدایە کە پێشەوا عیجلی دەیگێڕێتەوە و پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەربارەی «ئەبوو وەلید» فەرموویەتی: «لە حەفتا ئافرەتەوە فەرموودەی دەگێڕایەوە!»

نموونەی شەشەم: «سەخاوی» دەربارەی «ئیبن حەجەر» دەڵێت: «ئیبن حەجەر کەسێکی دیاری ئوممەی ئیسلامییە و خاوەنی پەڕتووکی (فتح الباري) ـە لە شەرحی سەحیحی بوخاری، قوتابییەکەیشی سەخاوی بوو، سەخاوی ژیاننامەی مامۆستاکەی واتا ئیبن حەجەر باس کردووە و تێیدا هاتووە کە ئیبن حەجەر لە بیست ئافرەتەوە فەرموودەی بیستووە!»

نموونەی حەوتەم: فاتیمەی جوزدانی، کاتێک پەڕتووکی (سیر أعلام النبلاء)ـم دەخوێندەوە، ناوی ئەم ئافرەتەم زۆر بەرچاو دەکەوت، هەر کاتێک دەربارەی کەسێک شتێکم خوێندبایەتەوە دەمبینی لە فاتیمەوە فەرموودەی گێڕاوەتەوە، لە ئەسفەهان دادەنیشت، پێشەوا زەهەبی دەربارەی دەڵێت: «موسەننەدەی سەردەمی خۆی بووە.» هەروەها دەڵێت: «ئەو ئافرەتە کۆتا کەسە لە دونیادا کە لە ئیبن ریزەوە شتی گێڕابێتەوە و زۆر فەرموودەی لێوە گێڕاوەتەوە، ئەبوو موسای مەدینی و زۆری دیکەش فەرموودەیان لەم ئافرەتەوە گێڕاوەتەوە.» سا ئەوەی زیاتر جێی سەرنج بێت ئەوەیە کە پێشەوا زەهەبی دەڵێت ئەم ئافرەتە گوێبیستی هەردوو فەرهەنگی گەورە و بچووکی تەبەڕانی بووە ـئاشکرایە کە فەرهەنگە گەورەکەی ١٦ بەرگە. و هەروەها گوێبیستی پەڕتووکی (الفتن)ی نوعەیمی حەمماد بووە لە ئیبن ریزوە ـبۆیە قسەکە لێرەدایە کە ئافرەتێک ئامادە و گوێبیستی ئەو پەڕتووکە گەورانە دەبوو و دواتر بۆ کەسانی دیکەی دەگێڕایەوە.

فاتیمە لە ساڵی ٥٢٤ی ک. کۆچی دوایی کردووە.

ئەمانە حەوت نموونە بوون هێنامانەوە لە چوارچێوەی بواری یەکەمدا کە ئەویش بواری گێڕانەوە و فەرموودەوانی بوو، لەنێو هەر نموونەیەکیشدا وەکوو بینیمان دەیان یاخود سەدان ژمارە و ناوی ئافرەتان هەبوون، ئەوەی سوودی لێ

دەبینین ئەوەیە کە ئەم بوارە زانستییە تایبەت نەبووە بە پیاوان جگە لە ئافرەتان، بەڵام بەبێ گومان و بەبێ بەراوردکردن ڕوونە کە ڕۆڵی پیاوان زیاتر بووە، بۆ نموونە کاتێک تۆ دەربارەی مامۆستاکانی ئەبی تاهیر سەلەفی یاخود جگە لەو دەخوێنیتەوە دەبینیت ١٣٠٠ یاخود ١٢٠٠ لە مامۆستاکانی پیاون و تەنیا ٨٠ و ئەوەندەیان ئافرەتن، بەڵام قسەکە لەوەدایە کە ئافرەتانیش ڕۆڵیان هەبووە و ڕێژەشیان کەم نەبووە، هەروەها تەنانەت ڕۆڵیشیان هەندێک جار ئاسایی نەبووە بەڵکوو گەشتووە بە ئاستێک کە دەربارەی یەکێکیان وتراوە: «ئاستی ئەهلی زەوی بە مردنی ئەو دابەزی!» کە مەبەست لە دابەزین لە گێڕانەوە و سەنەدە، چونکە فلانە ئافرەت سەنەدێکی لابووە زۆر بەرزبووە و لای هیچ کەسێکی دی بەو بەرزییە بوونی نەبووە، هەر لەبەر ئەمەشە کە پێشەوا زەهەبی دەڵێت سوور بووم لەسەر ئەوەی فلانە ئافرەت ببینم، لای کەسیش شاراوە نییە کە بواری فەرموودەوانی لەو قۆناغەدا بوارێکی ئاسان نەبووە، واتا وەکوو ئەو بوارانەی دیکە نەبووە تا تەنیا بە خوێندنەوە بەدەست بێت، بەڵکوو لەو قۆناغەدا وای خواستووە کە ئامادەیی هەبێت لە دانیشتگەکان و گوێ بگرێت، هەر بۆیە تەنانەت هەندێک لە ئافرەتان کە لەسەری خوێندوومەتەوە گەشتیان هەبووە و هەندێکیان گەشتیان کردووە بۆئەوەی گوێبیستی فەرموودە ببن.

کەواتە دەڵێین ئامانج لە هێنانەوەی ئەم نموونانە بۆ ئەوە نەبووە کە بڵێین پێویستە پیاوان گوێ لە ئافرەتان بگرن و ئافرەتانیش گوێ لە پیاوان. نا، بەڵکوو مەبەستەکەمان ئەوەیە ئافرەت ڕۆڵێکی هەبووە کە پەیوەست بووە بە بابەتە مەعریفییەکانی ئیسلام، ئەم ڕۆڵەشی خۆی لە گواستنەوەی فەرموودە و گێڕانەوە و ئامادەبوون لە دانیشتگەکان بۆ گوێگرتن لە فەرموودە...

## بوارەکانی فێرکردن و بانگەواز و فەتوادان و جگە لەوانیش

ئەم بوارەیان خۆی لەو نموونانە دەبینێتەوە کە باس لە ئافرەتە مامۆستا و شەرعزان و ئامۆژگاریکار، یاخود بانگخواز و ... هتد دەکات.

نموونەی یەکەم: «ستیتە»ی کچی قازی محاملییە، ئەم ئافرەتە هیچ کات مرۆڤێکی سادە و سانا نەبووە، لە پێشتردا باسمان کرد کە گێڕانەوە پێویستی بە دانیشتن و گوێگرتن هەیە لە مامۆستا و جگە لەوانیش، بەڵام بابەتەکە قورسترە تا ئافرەت بگات بە ئاستێک ببێت بە شەرعزان، یاخود موفتی، ئەمە زۆر قورسترە لە تەنیا باسکردن و گێڕانەوەی فەتوای زانایان ئەگەرچی ئەویش پێویستی بە کۆششێکی زۆر هەبێت لە ڕووی هەستان پێی، بەڵام ئافرەت بگات بە پلەی شەرعزانی و موفتێتی ئەمە شتێکی زۆر قورسترە، «ستیتە» لە سەدەی چوارمی هیجریدا ژیاوە و لەساڵی ٣٧٧ی ک. کۆچی دوایی کردووە، ئیبن کەسیر لە پەڕتووکی (البداية والنهاية) دەربارەی دەڵێت: «لە زۆر بوار شتی خوێندووەتەوە، فقە (زانستی میرات) و فەرزەکان، حیسابات و نەحوو و ... تاد. هەموو ئەمانەی لەبەر کردووە، لە سەردەمی خۆیدا لە شارەزاترین کەسەکان بووە بە مەزهەبی شافیعی و فەتوای تێدا دەدا، هەروەها کەسێکی چاکەکار بوو، ماڵی زۆر دەبەخشی، کێبڕکێی چاکەی دەکرد، لێیەوە فەرموودەم بیستووە و گێڕاومەتەوە.» پێشەوا زەهەبیش دەربارەی دەڵێت: «زانا و شەرعزان و موفتی بوو، هەروەها لە تێگەشتووترین کەسەکان بوو.» ئێمەش لێرەدا تەنیا ئەوەندە دەڵێین ئایا ئافرەت دەتوانێت بگات بە پلەیەک کە ببێت بە زانا و شەرعزان و فەتوا بدات یاخود ناتوانێت؟ لە وەڵامدا دەڵێین: بەڵێ، بێگومان دەتوانێت و نموونەی لەم شێوەیەشمان زۆرە لە مێژوودا.

نموونەی دووەم: زەینەبی کچی ئەحمەدی مەقدەسییە، ناسراوە بە کچی

خاوەن کەماڵ، ئەمەش لە ڕاستیدا خاڵێکی زۆر بەربڵاو و گرنگە. پێشەوا زەهەبی لەبارەیەوە دەفەرمووێت: «دەگمەن بوو بە ئەندازەی باری وشتر لە هەموو بوارەکانی زانستدا مۆڵەتی هەبوو، هەروەها ئافرەتێکی دیندار و چاکەکار بوو، ڕیوایەتی زۆری دەگێڕایەوە، فێرخوازانی زانستی شەرعی بەلێشاو دەهاتنە خزمەتی و پەڕتووکی زانا گەورەکانی ئیسلامیان لەلا دەخوێند، جگە لەوەش لەگەڵ فێرخوازەکانیدا ئافرەتێکی میهرەبان و پشوودرێژ بوو و زۆربەی ڕۆژەکە قسەی بۆ دەکردن، هەروەها ئافرەتێکی بە قەناعەت و داوێن پاک و دەست و دڵ کراوە و ڕەوشت جوان بوو، لە منداڵیدا چاوی تووشی گرێ بووبوو، تاوەکوو لە ژیانیشدا بوو هاوسەرگیری نەکرد و لە ساڵی ٧٤٠ی ک. کۆچی دوایی کرد.»

ئیبن حەجەریش لە پەڕتووکی (الدرر الکامنة) دەگێڕێتەوە کە بە مردنی، ئاستی زانستی خەڵک لە بواری فەرموودەوانی و زۆر شتی دیکەشدا زۆر دابەزی. هەروەها کۆتا کەسە لە دونیادا دەربارەی باسکردنی کۆمەڵەی پێشینی ئوممەت مۆڵەتی هەبووە، سا مەبەست لێرەدا ئەوەیە باسی یەکێک لەو ڕۆڵانە بکەین کە لە پێشووتردا بوونی هەبووە و ئەوەندەی بکرێت لەسەری بزانرێت.

گرنگترین خاڵێکیش لەم باسەی کردمان، ئەوەیە ئەم ئافرەتە پەڕتووکی زانا گەورەکانیان لە خزمەتیدا خوێندووە. بێگومان ئەمەش شتێکی ئاسان نییە، لە بەسەرهاتەکانیشدا لەوە ناچێت کە پوخت کەرەوەی پەڕتووک بوو بێت، یان تەنیا ئامۆژگارێک بوو بێت، ئەگەرچی ئەوەش بووایە هەر گرنگ بوو، بەڵام قسەکە لەسەر پەڕتووکی زانا گەورەکانە کە پێویستی بە برێک لە زانست و توانای کەسییە و لەگەڵ ئەوەشدا خودی خۆی و فێرکردن و خواستی زۆر

لەسەر بوون بە فێرخواز لە خزمەتیدا.

نموونەی سێیەم: هاوسەری شێخی پێشەوا میززی (خوای گەورە لێی خۆش بێت.) خاوەنی پەڕتووکی (تهذیب الکمال)ـە لە گرنگترین پەڕتووکەکانی (الجرح و التعدیل)ـە کە ٣٥، یان ٣٦ بەرگە، هەروەها خاوەنی پەڕتووکی (تحفة الأشراف)ـە و کە لە دەرهێنانی فەرموودەکانی شەش پەرتووکەکە بە پەڕتووکێکی زۆر مەزن دادەنرێت، هاوسەری «میززی» دایکی هاوسەری «ئیبن کەسیر»ی ڕاڤەوانی قوڕئانە، یاخود ڕوونتر بڵێین ئیبن کەسیر هاوسەرگیری لەگەڵ کچی «میززی»دا کردووە، ئیبن کەسیر لەبارەی دایکی هاوسەرەکەیەوە قسە دەکات و دەڵێت: «لە ڕووی پەرستش و خوێندنەوەی قوڕئان لەنێو ئافرەتەکانی هاوسەردەمی خۆیدا وێنەی نەبوو، ئەو خوێندنەوە ڕوون و زمان پاراوی و دەربڕینە جوانەی کە بۆ قورئانی مەزن هەیبوو، تەنانەت زۆرێک لە پیاوانیش لە ئاستی تەجویدەکەیدا دەستەوەستان دەکرد، هەروەها زۆرێک لە ئافرەتان لە خزمەتیدا قوڕئانیان تەواو دەکرد و لەگەڵیشیدا فێری خووڕەوشت دەبوون و کەڵکیشیان لە چاکەکاری و ئایینداری و پارێزکارییەکەی لە دونیادا دەبینی.»

بێگومان ئەمەش نموونەیەکی تری فێرکردنی ئافرەت بۆ ئافرەتە، بەڵام تەنیا فێرکردن نا، بەڵکوو سوارچاکی ئەو مەیدانە بوو، کە ئەویش جوان خوێندنەوەی قورئان و تەجوید بوو، بە جۆرێک ئیبن کەسیر باسی کردووە ـئیبن کەسیر لە زانا هەرەگەورەکانی قورئان بووەـ ئەم ئافرەتە لە جوان خوێندنەوەی قورئاندا لە ئاستێکدا بووە کە زۆرێک لە پیاوانی دەستەوەستان کردووە و ڕۆڵی سەرەکی ئەوە بوو قورئان فێری ئافرەتان بکات، هەربۆیە ئافرەتانێکی زۆر قورئانیان لە خزمەتیدا تەواو کرد.

ئینجا بابەتی بونیادنانی خود و خواپەرستی و لەخواترسان دێت، ئەمەشیان وەک ئەوە نییە کە تەنیا ئەرکێکی دیاریکراوی هەبێت و تێیدا پسپۆڕ بێت و مووچەی لەسەر وەربگرێت. نا، بەڵکوو ئافرەتەکان کاتێک زانستی لێوە فێر دەبوون، لەهەمان کاتیشدا لە چاکەکاری و خواپەرستی و لەخواترسانەکەی لە دونیادا سوودمەند دەبوون، بگرە دەتوانین بڵێین پێشەنگێکی باڵا بوو بۆ فێرخوازەکانی، ئەمەش دۆزی خوێندنی ئافرەتانمان بیر دەخاتەوە کە لێرەدا نموونەی ئافرەتێکمان هەیە کە ئیبن کەسیر لە کۆچکردووەکانی ساڵی ٦١٥ دا باسی کردووە لە پەرتووکی (البداية والنهاية)، لەو باسەشدا وەسفێکی کورت و دیاریکراوی ئەو ئافرەتە سەرنجی ڕاکێشام کاتێک دەڵێت: «مامۆستایەکی چاکەکار و خواپەرست و پارێزکار و هەروەها مامۆستای زانایانی دیمەشقیش بوو. ئەمەش بێگومان ئاماژەیە بە بوونی جووڵانەوەیەکی زانستی لەو سەردەمەدا کە ئافرەتان هەوڵیان لەپێناودا داوە.»

نموونەی چوارەم: عائیشەی کچی حەسەنی کوڕی ئیبراهیم، پێشەوا زەهەبی لە پەرتووکی (سير أعلام النبلاء) لە بارەیەوە وتوویەتی: ئامۆژگارێک و زانایەکی پایەبەرز بوو، کاتێک وەسفی ئامۆژگارم بینی، سەرنجی ڕاکێشام دایکی ناوی فەتحی ئەسبەهانی بووە، سەمعانی فەرموویەتی کە دەربارەی پرسیارم لە حافز ئیسماعیل کرد و ئەویش فەرمووی ئافرەتێکی چاکەکار و زانا و شکۆی ئافرەتان بوو، ئەو یەکەم کەس بوو فەرموودەم لێوە بیستبێت، باوکم ناردمییە خزمەتی، لەگەڵ ئەوەشدا ئافرەتێکی لەخواترس بوو.

نموونەی پێنجەم: لێرەدا بوارێکی تر دێتە ئاراوە، ئەبوو تاهیری سیلەفە کە باسمان لێوە کرد و لەلایەنی مادییەوە کەسێکی هەژار بوو، هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتێکی چەپ دەست کرد کە قوتابخانەیەکی بۆ فێرخوازەکان

دامەزراند. ئەمەش خۆی لە خۆیدا بەشێکە لە هاوبەشیکردن و هاوبەشییەکی ژیرانەیە لە بواری فێرکردندا، بێگومان ئەوەش تەنیا بەخشینێک نەبوو بۆ هەژارەکان، بەڵکوو وەقفی قوتابخانەیەک بوو.

نموونەی شەشەم: کچی مەسعوود کوڕی مەودود کوڕی زنکی، لە نەوەی زنکییەکان بوو، ئیبن کەسیر لەبارەیەوە وتوویەتی: «فێرگەی ئەتابەکی لە سالحییە وەقف کردووە، هەروەها وەکوو ئەوەی خوێندوومەتەوە لەسەری ماوەیەک بەردەوام بووە نازانم هەتا کەی؟! بەڵام ئەم فێرگەیە بەردەوام بووە.»

تاوەکوو ئێستا ئەوە سێ نموونەمان لەسەر وەقفی ئافرەتان باس کردووە، ئەو وەقفەی هەندێک لە ئافرەتان بۆ خزمەتکردنی زانست کردوویانە، تۆی خوێنەریش وەها بیر مەکەوە کە ئەم کاریان تەنیا پەیوەندی بەوەوە هەبوو بێت کە سامانیان هەبوو بێت ... نەخێر، بەڵکوو ڕۆشنبیری و هۆشیارییەکی دیاریکراویان هەبووە و پێی ناسراونەتەوە و پەییان بەوە بردووە کە یەکێک لە باشترین بوارەکانی تێیدا پێش بکەون، بواری وەقفی فێرکردنە.

لەو نموونانەی کە باسم لێوە کردن، تاوەکوو ئێستا هیچ نموونەیەکی دووبارەم لە نموونەکانی پێشووتر باس نەکردووە، سا ئیدی لێرەدا مافی خۆیەتی ئەمڕۆ باسی نموونەکانی پێشتر بکەم و مەزنترین نموونەیەکیش باسی لێوە بکەم کە ئەویش عائیشەی کچی ئەبوو بەکری سەددیقە (خودا لێ ڕازی بێت.) لەبەر ئەوەی لە دۆزی زانست و زۆر شتی تردا پێویستە باس لە فێرخوازەکانی دایکە عائیشە (خودا لێ ڕازی بێت.) بکەین، لەگەڵ زۆر شتی دیکەدا.

هەروەکوو پێشتریش باسم لێوە کرد، زۆر نموونەی تر ماون باسیان لێوە بکەم، بەڵام ئەو نموونە هەڵبژێردراوانەی ئێستا و پێشتر باسم لێوە کردن گرنگییەکەیان

لەوەدایە کە لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) و دوای سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) بووە، بێگومان ئەم نموونە هێنانەوانە و ئەم وێناکردنە گشتییە و هەروەها لەگەڵ ڕوانین لەو کەلێنە گەورەیەی لە واقعدا دروست بووە پێویستە لە گرنگترین یاساکان بێت کە وامان لێ بکات بیر لە پرسی گەڕاندنەوەی ڕۆڵی ئافرەتان بکەینەوە.

کەواتە دەپرسین ئەو بوارانە کامانەن کە لە ئێستادا پێویستە ڕۆڵی ئافرەتانی تێدا ببوژێنرێتەوە؟

پێشنیار دەکەم لە کاتی باسکردنی ڕۆڵی ئافرەت لەمرۆدا سەرنج بخرێتە سەر پێنج بوار لەگەڵ ئامادەگی ئەو نەخشەی بەرپرسیارییەتییەی کە پێشتر باسمان لێوە کردووە، چونکە گونجاو نییە ئەم بوارانە لەوانەی پێشتر باسکراون داببڕێنرێت و زۆر گرنگە پەیوەندییەک لەگەڵ ئەوەی لە ڕابردوودا ڕوویدا هەبێت و ئەوانەی ئێستا باسیان لێوە دەکەین لەسەریان بونیاد بنرێت، ئەوانیش بەرپرسیارییەتییە گرنگەکان و ئەو پرسە گرنگانەن کە ئافرەتان لە سەردەمی پێغەمبەری خودادا (ﷺ) پێیەوە سەرقاڵ بوون.

ئەمەش بوارەکانن:

بواری یەکەم: بواری زانیاری کە دەکرێت بە سێ بەشەوە: شەرعی، هزری و ڕۆشنبیری.

بواری دووەم: بواری بانگخوازی

بواری سێیەم: بواری فێرکردن

بواری چوارەم: بواری پەروەردە

بواری پێنجەم: بواری چاکسازی گشتی

## بواری یەکەم: زانستی

هەر وەکوو ئاماژەمان پێ دا کە سێ بەشە: شەرعی، هزری، ڕۆشنبیری.

کاتێک ئێمە باسی ئەوە دەکەین کە ڕۆڵی ئافرەت لەم بوارانەدا زیندوو بکرێتەوە، مەبەست ئەوە نییە ئێمە بێین سەیر بکەین و بڵێین: «خەڵکینە! ئەم بوارە تەنیا پیاوی زۆر تێدایە ئافرەتی بۆ زیاد بکەین ...» نەخێر، بەم شێوازە نییە، بیرۆکەکە ئەوەیە کە بەشێک لە پرسەکان هاوبەشن و هیچ پسپۆڕییەک بوونی نییە کە تەنیا بۆ پیاوان پێویست بێت و بۆ ئافرەتان نەبێت. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ بیرۆکەیەکی بنچینەیی کە باسمان لێوە کردووە، ئەویش ئەوەیە لە هەر شتێک لە بوارەکانی شەریعەت و زانست و بانگەواز و فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگریکردن لە خراپە کە مرۆڤی موسڵمانی بۆ بانگ دەکرێت، دواندنێکی هاوبەشە، ئیدی پێویستمان بە دواندنێکی دیکەی تایبەت بە ئافرەت نییە کە پێیان بوترێت داخوازی زانستی شەرعی بکەن، یاخود پێویست ناکات بڵێین ئافرەتانی پشتیوانان ئاوا و ئاوایان دەکرد و وایان دەوت ... یاخود بڵێین فەرمووودەوان و شەرعزان و فەتوادەربوون ...

نەخێر، لە بنەڕەتدا پێویستمان بەو نموونانە نییە، بەڵام ئێمە باسمان لێوە کردن لەبەر بوونی خڵتەوخاڵ و ڕێگری زۆر و هەروەها لەبەر لەرزۆک بوونی متمانەی ئافرەت بە خودی خۆی و پێگەکەی. بەداخەوە زۆربەی ئەو ئافرەتانەی متمانەیەکی لەرزۆکیان هەیە، ئەمانە ئەو ئافرەتانەن گرنگی بە ئیسلام و ئایینەکەیان دەدەن و ... تاد. هەروەها زۆر جار ئاستێکی ئیمانی زۆر گەورەی هەیە و هەستێکی گەورەی هەیە بیەوێت شتێک پێشکەش بکات، بەڵام دواتر، یان نەبوونی متمانە بەخۆبوون بەوەی کە دەتوانێت شتێک

پێشکەش بکات، یاخود واقیعەکە ڕێگە نادات شتێک پێشکەش بکات ...

هەربۆیە ئێمە کاتێک دەڵێین بوارەکان بۆ نموونە بواری شەرعی کەسێک نەیەت و بڵێت لە حوکمەکانی تایبەت بە ئافرەتان دەتەوێت پسپۆڕ بیت؟ نەخێر، نەخێر! کاتێک ئێمە ئەم باسانە دەکەین ڕووی قسەکە لە هەمووانە، ئیدی هەر زانستێکی شەرعی کە وەسفی لە شەریعەتدا هاتووە ڕێگەپێدراوە ئافرەت ئەنجامی بدات، کاتێک ئەو پرسیارە دەکرێت: «ئایا دەتوانێت شتێک لە بواری شەرعی پێشکەش بکات؟» بەڵێ، دەتوانێت و بەڵگەش نموونەگەلێکن لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) و دواتردا هەبوون و تاوەکوو ئێستاش هەن، لە بەرجەستەترینیان دایکە عائیشە (خودا لێی ڕازی بێت.) و خێزانەکانی پێغەمبەر (ﷺ) و ئافرەتانی دیکەی کۆمەڵگەی ئیسلامییە.

بەڵام منیش لەگەڵ ئەوەم ڕەچاوی ئەو بوارانە بکرێت کە پێویستیان بە ئافرەتانە ئەمڕۆ ... ئەو پێویستییە پەیوەندی بە لایەنی خزمەتی خودی بوارەکەوە نییە، ئێمە کاتێک دەڵێین ڕۆڵی ئافرەت بگەڕێنرێتەوە، گەڕاندنەوەی لە بواری شەرعیدا، ئەگەر کەسێک هات و وتی: «دەتوانن چ پەرتووکێکی نوێ بنووسن؟! لە زانستی شەرعی سوپاس بۆ خوا پەرتووکی زۆرمان هەیە و ...» نەخێر، نەخێر! مەبەستمان ئەوە نییە کە پسپۆڕ بکرێت لە بواری شەرعدا بۆ ئەوەی شتێک بۆ بوارەکە زیاد بکات. نەخێر، بەڵکوو مەبەستەکە ئەوەیە نەریتی زانست بەردەوام بێت، مەبەستەکە ئەوەیە کە ئەو زانستەی لە ڕابردوودا هەبووە بگواسترێتەوە بۆمان، مەبەست ئەوەیە بووژاندنەوەیەک هەبێت بۆ ئەم زانستانە و هەر کەسێک کە توانای هەبێت لە پیاو و ئافرەتان کاری تێدا بکەن، هیچ کەسێک نەی وتووە دەست بکە بە زانستی شەرعی بۆئەوەی تێکۆشەرێکی ڕەهای سەردەمەکەت بیت و شتێک بۆ ئەو ڕێبازەی هەیە زیاد

بکەیت. نەخێر! هیچ کەس وا نالێت ... بەڵام بابەتەکە ئەوەیە کە یەکێک لەو ڕۆڵانەی ئافرەت دەتوانێت بیبینێت ئەوەیە زانستی شەرعی فێر ببێت و سوودی لێ ببینێت و خەڵکیش لێیەوە فێری ببن.

بواری شەرعی بواری شەرعی وردەکاری زۆر لەخۆ دەگرێت ...

بواری هزری: بە ڕای من بواری هزری یەکێک لە گرنگترین بوارەکانە کە پێویستە ئافرەتان ڕۆڵی تێدا ببینن ... بۆچی؟ بە ڕوانین لە زۆری ئاریشەی هزری پەیوەست بە پرسی ئافرەتان و هەروەها ئەوەی کە چارەسەرکردنی ئاریشەی ئافرەت بەدەستی ئافرەت کاریگەرییەکی زۆر زیاتری هەیە کە زۆرێک لە پیاوان پێی ناگەن، دواتر لێکۆڵینەوەی بوارە هزرییەکان بەو نیەتەوە، لە بابەتە گرنگەکانە، سەرنج بدەن! ئێمە باسی ئامرازەکانی ئێستا ناکەین ... دواتر چۆن سودمەند دەبێت؟ ئەم پێشهاتە ڕەچاوی بارودۆخ و هەلومەرجی لەباری کەسی تێدا دەکرێت ... لەوانەیە ئەو توانای قسەکردنی پێ نەبەخشرابێت، یان حەزناکات قسە بکات، لەوانەیە حەز نەکات لە شوێنی گشتیدا دەربکەوێت، کەس ناتوانێت پێی بڵێت بڕۆ لە شوێنی گشتیدا دەربکەوە، واتە ئەم بابەتە بەو واتایە نایەت کە فێری بواری هزری بوویت ئیتر سبەی دەبێت لە یوتیوب کەناڵێکت هەبێت و قسە بکەیت ... نەخێر، مەبەستەکە ئەمە نییە، واتە گەمارۆنادرێیت بە ئامرازەکان ... واتە دەکرێت نووسەر بیت، دەکرێت وتارنووس بیت، دەکرێت ناوەندێکی هزری فێرکردنت هەبێت کە ئافرەتان فێر بکەیت تێیدا ... بە پوختی ئامرازەکانی گەیاندنی بوارە هزرییەکە دیاری نەکراون ...

بواری سێیەم: ڕۆشنبیری و بواری ڕۆشنبیری بوارێکی زۆر زۆر گرنگە، مەبەستمان لێرەدا ڕۆشنبیری ئیسلامییە، کە نموونەی ئافرەتێکی موسڵمانی

ڕۆشنبیرە، ئافرەتێکی موسڵمانی پابەند و لەخواترس و چاکەکار زیندوو و لە هەمان کاتدا ڕۆشنبیر و ئەم بواری ڕۆشنبیرییە لە زۆربەی کاتدا لە واقیعی ئێستاماندا بەسوودترە لە ئەوەی کە پسپۆڕی هزری بێت، یان پسپۆڕی شەرعی بێت ... لەبەرئەوەی زۆربەی جەماوەری وەرگر لە ئافرەتان و کچان لە تۆڕەکانی کۆمەڵایەتییەکان ئەو کۆمەڵانەن کە بە لایانەوە زۆر جیاوازی نییە ئەو کەسە پسپۆڕی شەرعی بێت، یان تەنیا ڕۆشنبیرییەکی ئیسلامی هەبێت، بتەوێت و نەتەوێت کاتێک ئێمە باسی ڕۆشنبیر دەکەین باسی ڕۆشنبیرێکی پابەند بێت، نەک تەنیا زانیاری، لەبەرئەوە من داوا دەکەم کە ئافرەتان گرنگی بە لایەنی ڕۆشنبیری بدەن، واتا مەبەست لێرەدا ئەوەیە کە ئافرەتان ڕۆشنبیرێکی شەرعزان و ئایینداربن، نەک بەتەنیا ڕۆشنبیرێک.

## بواری دووەم : بواری بانگەواز

مەبەست لێی ئەو بوارەیە کە تێیدا گرنگی بە ژیانەوە و پاڵفتەکردنی دەروون و گێڕانەوەی خەڵک بۆ ئایین دەدات، کاتێک قسە لەبارەی ئەم لایەن و بوارەوە دەکەین، واتای ئەوە نییە کەسێک گەر لەم بوارەدا بێت، یان بیەوێت بێتە نێوی، نەتوانێت بچێتە نێو بواری دیکەوە، بەڵکوو مەبەست لێی ئەوەیە کە ئەمە بوارێکە شیاوی خۆ بۆ یەکلاکردنەوەیە، سا گەر سەبارەت بە ڕۆڵی ئافرەت بپرسن چ شتێک لە پێشینەیە، ناتوانم ئەم بوارە پشتگوێ بخەم و ئەگەر نەڵێم یەکەمە، ئەوا نابێت ڕیزبەندی دووەم و سێیەم تێبپەڕێنێت.

لە گرنگترین و گەورەترین ڕۆڵەکان لە ئەمڕۆدا سەبارەت بە ئافرەتی موسڵمان کە دەتوانێت ئەنجامی بدات، ئەوەیە کە لە بواری بانگەوازدا

دەستبەکار بێت، ئەگەر بناڵێنین و سکاڵا بکەین لەدەست زۆریی وتار و شێوازی وتارەکان. تەنانەت سەبارەت بە ئافرەتیش کەلێنێک لەو وتارانەدا هەیە کە جیلی پێشووتر بۆ خەڵکیان باس کردووە، بۆ ئەو ئافرەتانەی جیاوازییەکی زۆری تەمەنیان لەنێواندا نییە لەگەڵ کۆڕی ئافرەتانی بەتەمەن، گرنگ و پێویست و جێی بایەخ کە هەبن و زانیارییان زیاتر بکەن و بایەخ زیاتر بە لایەنە باوەڕ و پاڵفتەکردنی دەروون بدەن و نموونە پێشکەش بکەن. باشترین نموونەیەکیش لەم بوارەدا پێشکەشی بکەن دەبێت نموونەی زیندوو بێت، بۆیە لەڕاستیدا دیاریکردنی سنوورێک و بەستنەوەی ئافرەت بە یەک ڕۆڵەوە وەکوو ڕۆڵی هزری، یان ڕۆشنبیری کارێکی هەڵەیە.

بەرێزان ئەمە ئەوەش نییە بڵێین پرسی دووبارە گێڕانەوەی ڕۆڵی ئافرەتە، یان سەرخستنی ئیسلامە بە زۆرانبازی، یان ژیانەوەی واقیع، یان ژیانەوەی ... تاد.

ئێمە دەزانین کە دوورکەوتنەوە هەیە و هەندێک جار بەهێواشی و هەندێک جار بەخێراییەکی زۆر خەڵکی لەناوەند و چەقی ئایینەکەیان دوور دەخرێنەوە کە ئیسلامە، بۆیە ئافرەتان لە ئەمڕۆدا پێویستە گورج و بەپەلە بەو ڕۆڵە ڕابن تا بارودۆخی خەڵکی لە بناغەوە لەو ڕووانەوە باش بکات کە پەیوەستە بە باشکردنی پرسی ئایین، پاراستنی نوێژەکان، گرنگیدان بە کرداری دڵ و خۆشویستنی خودا و بابەتە هاوپەیوەستەکان.

ئەم پرسە لەو پرسانە نییە بشێت پشتگوێبخرێن و دوابخرێن، بەڵکوو ئەمە بەرپرسیارییەتییەکی ڕاستەقینەیە، بۆیە تکام وایە هەر ئافرەتێک دەیەوێت، یاخود پێی وایە دەتوانێت ڕۆڵی هەبێت، با دەستبەتاڵ و دەستبەستراو نەبێت و لەم سوورە بانگخوازییە چاکسازییە ئیمانییەدا پشکدار بێت، ئەمەش زۆر

گرنگ و پێویستە، دۆخمان زۆر دژوار و جێداخە، بەتایبەت لە ڕووی وەلانان و گرنگینەدان بە بابەتە ڕۆحییەکان و دوورکەوتنەوە لە بنەڕەتەکانی ئیسلام و ... تاد. بۆیە ڕۆڵی ئافرەت ڕۆڵی ژیاندنەوە و بوژاندنەوەی دروستی پەیوەندی بەندەیە بە خودای خۆیەوە.

کێ بە توێژی فراوانی کچان ڕادەگات ؟!

کە ئێوە دەزانن لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان ئەوانن زۆر سۆراخی دەنگ و باسی کەسە بەناوبانگەکان دەکەن لە ئینیستاگرام و هاوشێوەکانی، جا بەناوبانگەکان لە هەردوو ڕەگەز ...

چی دەبینیت؟! کۆمەڵە شتێک لەو پەڕی جێی داخدا، ئەی دواتر؟!

ئەو هەزاران و ملیۆنان کچە موسڵمانە کە لەڕاستیدا بۆ هیچ ئامانج و پێناوێکی گەورە و گرنگ و بەهادار ناژین، یان تەنانەت بۆ ئەو واتا کەسییانەشی لەپێناویدا وەدیهاتووە، باشە چۆن؟!

بۆچی؟!

کێ دەتوانێت بەم ڕۆڵە هەستێت؟!

با گریمانەی نموونەیەکی تر بکەین، چی ئەگەر لە ناوەڕاستی خوێندکار و فێرخوازاندا بوژانەوە ڕوو بدات؟! یەکەم شتیش بەرپرسیارییەتی بێت کە دەبوژێتەوە، هەر کەسەش شتێک پێشکەش بکات و هۆکارەکانیشی سنووردار نەکرابن، ئەوەم بە خەیاڵدا نایەت کە هەر دەبێت لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکاندا هەژمارێکم هەبێت، نا، با بەڕاستی و لەنێو تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانیشدا هەبێت، با بوارەکان هەر سنووردار نەبن، بەڵام بە ڕای من گرنگترین ڕۆڵ، یان بڵێین

لە گرنگترینەکان کە بانگەشەی ئەوە دەکەن ئافرەت بگێڕنەوە بۆ پێگەی خۆی و گرنگییەک کە ڕۆڵ و جێپەنجەیان هەبێت و پێویستییەکی وا نییە لە خۆشیان بێت و بەڵکوو لایەنی ژیانەوەی ئیمانییە، هەڵبەت ئێستا کاتی باس و خواسی ئەوە نییە و ئەوە ئەو پێویستییە نییە لەم بوارەدا قسەی لێ بکەم و بەڕتووکەکە بەشی ئەوە ناکات بچینە سەر باسی ئەو پرسە، بەڵکوو لە کات و شوێنی دیکەدا باس و خواسی لەبارەوە دەکەین.

## بواری سێیەم: بواری فێرکاریی

بواری فێرکاری، هەڵبەت هیچ دژیەک و تێکگیران و لێکهەڵوەشان و لێکهەڵاتنێکی نییە لەگەڵ بواری زانیاریدا، بەڵام بواری زانیاری پێویست نییە بێتە نێو بواری فێرکاریی.

بواری زانیاریی دەشێت یەکێک تێیدا پسپۆڕ بێت و هەندێک توێژینەوە ئەنجام بدات، بەڵام ئێمە ئێستا دەربارەی پرۆسەی فێرکردن قسە دەکەین کە مەبەست لێی خودی فێرکردنە، ئەگەر سەرنج لە نموونەکانی پێشوو بدەن، هەندێک نموونەی تێدایە لەبارەی فێرکردنی ئافرەتانەوە.

بەڵێ، بەڕێزان یەک لە مەزنترین پێکهێنەکانی هێز لە واقیعی ئیسلام و موسڵمانان و مێژوویاندا بریتییە لە بەردەوامیی پرۆسەی فێرکردنی ئیسلامی، لە بەهێزترین پێکهێنەکانی هێز تەنیا پاراستن و دەستاودەستکردنی زانستە. ئەمە یەکێکە لەو پرسانەی مەرج و بناغەیە بۆ گشت ئەو دیدگایانەی لەو گەورە و بەرزتر لەسەریان ساز دەکرێت، بۆیە دەمانەوێت ڕۆڵی مامۆستایانی ئافرەت بگێڕینەوە، جا ڕەنگە یەکێک بڵێت: «لە کەرتی فێرکردن دا (ما شاء

الله) مامۆستای ئافرەت ئەوەندە زۆرە تا قیامەت تەواو نابێت.» بەڵام ئێمە دەربارەی ئەو فێربوونە قسە ناکەین، کە پیشەیەکی دیاریکراوە و ملکەچی وێناکردنێکی دۆخی دیاریکراو و هاوپەیوەست بە لایەنی فێرکاریی ئێستا، ئایا واتە ئەو مامۆستایانەی ئێستا هیچ ڕۆڵی نییە؟!

نا، ڕۆڵی هەیە، بەڵام ئەو لایەنی فێرکارییەی ئێستا قسەی لەبارەوە دەکەین دەبێت ئەوە لەخۆ بگرێت تاوەکوو مامۆستا لەم بوارە فێرکارییەدا بەشدار بێت، بەڵام ئەم فێربوونی گشتییە کەڵک و بەرهەمی خۆی هەیە. ئەو شێوازێکی دیاریکراوە نە شێوازی تایبەتی ئیسلام دەپارێزێت و نە ڕووشی لەو خوێندنەیە، لێشتان شاراوە نییە کە ئەوە دۆخی فێرکردنی گشتییە و سەراپای کێشەیە لە ڕووی سروشتی زانیاریپێدان و ... تاد. بەڵام لە پێشترین ئافرەتانێک کە دەبێت بواری فێرکاری و بانگخوازی بپارێزن، ئەو مامۆستایانەن کە لە چوارچێوەی گشتیدان، هەروەها زۆرترین کەسانێکن کە دەکرێت کاریان تێ بکرێت، یان پشتگوێ بخرێن، بۆچی؟! چونکە گومانی وایە کە تەنیا لەبەرئەوەی ناوی فەرمیی مامۆستایە، یان سیفەتی پیشەیی، یان هەڵدەستێت بەو پرۆسەی فێرکردنە کە قسەی لەبارەوە دەکەین. نەخێر، ئەوە نییە و هەرگیز لە ڕووی پابەندییەوە مەبەست ئەوە نییە، بەڵکوو لێرەدا مەبەست لێی پاراستنی فێرکاریی ئیسلامییە، بۆ نموونە فێرکاریی تایبەت بە شەرعزانی (فیقھ)، زانستی فەرموودە، بیروباوەڕ، بنەماکانی ئیمان، فێرکردنی قورئان و ... تاد. جا ئەگەر بگونجێت و ڕێک بکەوێت، ئەوە بواری مامۆستای ئافرەت لە بنەڕەتدا لەم ڕووەوە بوارێکی فێرکاری بە کەڵکە و با نییەتی ساغ بکاتەوە و سوپاس بۆ خودای گەورە. هەوڵ دەدات کەلێن و کەموکورتییەکە نەهێڵێت، ئەمەش کارێکی زۆر باشە، بەڵام من مەبەستم ئەوەیە هێشتا بەس نییە، مادام

ئێمە لە چوارچێوەی گشتیدا مامۆستامان هەبێت، ئەوە ئەو ڕۆڵە فێرکارییەیە کە ئافرەت پێی هەڵدەستێت. نا، نا! ئەوە ئەو ڕۆڵی فێرکارییە نییە کە ئافرەت پێی هەڵدەستێت، بەڵکوو ئەوە دوانگەیەکە لە دوانگەکان دەکرێت هەر ئاگادارکەرەوەیەکی ئاسایی بێت و زۆرێک هەر لە بنەڕەتدا وەکوو پیشەیەک سەیری دەکەن، بەڵام ئێمە لێرەدا مەبەستمان لەو واتایانەیە کە مرۆڤ لەبەرچاوی دەگرێت و مەبەستییەتی و دەیەوێت لێوەی سوننەتی زانست و گواستنەوە و فێرکردنی بپارێزێت و لە نییەتی خۆیشیدا دەشێت هاوتا، یان دابڕاو بێت لەگەڵ شتی دیکەدا.

## بواری چوارەم: بواری پەروەردەیی

ئەمەش دوو بەشە: بواری پەروەردەیی گشتی و بواری پەروەردەیی تایبەت.

بواری پەروەردەیی تایبەت ئەوەیە کە لەنێو خێزاندا هەیە، ئەمەش لە بنەڕەتەوە پەیوەستە بەوەوە کە ئافرەت دایک بێت، هەروەها من پێشتر ئاماژەم بەوەدا کە هەندێک جار لەو هەڵانەی ئەنجام دەدرێن لە باسکردنی پرسی ئافرەتدا گریمانەکردنی ئەوەیە هەموو ئافرەتێک کە قسەی بۆ دەکرێت دایک بێت، ئەمەش لێتێکچوونە، لەڕاستیدا زۆربەی ئەو ئافرەتانەی گوێبیستی قسەکانن دایک نین، بەڵام ئێمە قسە دەربارەی دایکان دەکەین، لە ڕووی ڕۆڵی پەروەردەییەوە دایکان بژاردەیەکی لاوەکیی پەراوێزیی تەواوکاریی نین، بەڵکوو لە گرنگترین ڕۆڵەکانە کە ئافرەت دەتوانێت پێی هەستێت و دەبێتیش پێی هەستێت.

ڕۆڵی پەروەردەیی تایبەت، ئەمڕۆ ئەو ڕۆڵە پەروەردەییە تایبەتە پێگە و گرنگیی لە پێشوو زیاترە، بەڵێ بەڕێزان هەرچەندە ئەو دەروازانە زیاتر بێت کە

مرۆڤی لێوە پەروەردە دەبێت، ناوەندبوون، یان پێویستبوون، یان فرەخوازی چڕیی، پەروەردەیی نێو ماڵ کەمتر دەبێت، ئەمەش لە قۆناغەکانی پێشوودا هەبوو، واتە شوێنی بنەڕەتی لەکوێیە زۆربەی خەڵکی لێوەی پەروەردە دەبن و فێر دەبن؟! لە دەرەوەی ماڵە ... پێشتر لە مێژووی ئیسلامیدا نموونەکە دەزانیت کە چووەتە نێو پەڕتووکەکانیشەوە «مامۆستاکە خەریکی پەروەردە و فێرکردنە» خەڵکێک هەبوون ناویان پەروەرشیار بووە بەتایبەت ئەوە لەنێو چینی دەسەڵاتدار و سوڵتانەکاندا بەربڵاو بوو کە بۆ کوڕەکانیان دەیانگرتن، فلان مامۆستایان دەهێنا تا کوڕەکەیان پەروەردە بکات، بیرۆکەیەک کاتێک ڕۆشنبیرییەکی پێوەریی لە نێوەندی زانستیدا باڵایە کە گرنگی بە منداڵان دەدات و شتی دیکەش لە پەروەردەدا، ڕۆڵی ئافرەت یەک ناخات و بەدڵنیاییەوە ڕۆڵی یەک ناخرێت، چونکە چەقە، بەڵام زۆر باری لە کۆڵ دەکەوێت، هەروەها بە ئەندازەی ئێمە لە بارودۆخێکی پێچەوانە داین بۆ ئەم واتایە و بابەتەکە وای لێ هاتووە ڕوو بە وێنەیەکی سەخت و پڕ گرێتر دەڕوات، بە جۆرێک کە ئەگەر دایک لە ماڵدا بە ڕۆڵی خۆی هەڵنەستێت، زۆر قورسە منداڵەکان لە دەرەوەی ماڵ شوێنێک بۆ یەکتاپەرستی بدۆزنەوە، ئەگەر منداڵ ناوەندێکی پەروەردەیی هەبێت، یان شتێکی دیکەی هاوشێوە، لە گەورەترین بەخششەکانە کە دەکرێت دایک پێی ببەخشێت و کۆڵێکی گەورەی لە کۆڵ بکاتەوە، هەڵبەت ئەوە وەک تەواوکار و پاڵپشت دەمێنێتەوە، بەڵام بیرت لەسەر کرۆکی مەبەست و ئامانجەکەیە.

بەڕێزان ئەمڕۆ بە هۆی زۆریی کارتێکەری دەرەکی، ئێمە قەڵاکانمان یەک لە دوای یەک دەکەون. تەنیا قەڵا بمێنێتەوە ماڵە، قەڵای بچووککراوی ماڵ، ماڵ خێزان نییە، نا! بەڵکوو مەبەست قەڵای بچوککراوی ماڵە، دایک

و باوک و منداڵ. تۆ ئەگەر بتەوێت یان نا، ئەمڕۆ گرنگی و پێگەیەکی سەرەکیت لە ماڵدا هەیە، کاتێک باسی ڕۆڵی ماڵ دەکەین، ڕۆڵی دایک لەم بابەتەدا بە پلەی یەک دێت، بۆ ئەم پێناوە کاتێک ئێمە دەڵێین بواری دووبارە گێڕانەوەی ڕۆڵی ئافرەتە، مەبەستمان بوارە گشتییەکان نییە بە تەنیا، بەڵکوو لە گەورەترین شتێک کە دەتوانێت دووبارە ڕۆڵی ئافرەتی پێ بگێڕدرێتەوە، بواری پەروەردەیی تایبەتە لەنێو ماڵدا.

## بواری پێنجەم: بواری چاکسازیی گشتی

لێرەوە پرسی هاوبەش و لێکدراوی نێوان هەردوو بواری پەروەردەیی گشتی و چاکسازیی گشتی دەبێت، هەروەها ئەوە لە گەورە و گرنگترین بەرپرس و داخواز و پێویستییەکانی ئەمڕۆیە بۆ چاکسازیی بارودۆخی ئیسلامی و موسڵمانان و لەنێویشیاندا بارودۆخی ئافرەت، ئەویش بریتییە لە چڕکردنەوەی ناوەندە پەروەردەییەکان و بەتایبەتیش هی ئافرەتان کە پاڵپشتی ڕۆڵی پەروەردەیی تایبەت بە دایکە و بەرگری و بازنەی پارێزەری زیاتر دەبەخشن ڕوو بە گشت هەڵمەتەکانی خستن و دوورخستنەوە و لێکبڵاوکردنەکان ڕوو بە موسوڵمانان و بە تایبەت ئافرەتان، بۆیە ئەگەر بڵێین بواری ئافرەت چاکسازیی گشتی و پەروەردەیی گشتییە، ئەوا یەکێک لە گرنگترین وێنەکانی چاکسازیی گشتی، بواری پەروەردەیی گشتییە.

بۆیە بەڕێزان پێویستمان بە ناوەندی پەروەردەیی ئافرەتان هەیە کە بەرنامەی پەروەردەیی ئافرەتان و کچان پێشکەش بکات، جا ئەگەر خوا سەرکەوتووی بکات لە بەرنامەیەکی وەها دا بێت، یان کەلێنێک لە کەلێنەکان بگرێت با ئەم

کەلێنە بگرێت، لەبەرئەوەی لە گرنگترین کارەکانە، جا ناوەندێکی پەروەردەییی ئەلیکترۆنی بێت، یان ڕاستەقینە، ئەوە گەورەترین کەلێنێکە لە ئەمڕۆدا و بە کەم سەیرناکرێت و لە پێگەی کەم ناکرێتەوە و وا گومان مەبە ئەو ئافرەتەی بەمە هەستاوە خەریکی شتێکە (کە بڵێین سادە و هیچە) سوپاس بۆ خوا.

نا، نا! بەڵکوو شتێکی زۆر زۆر گرنگە و بەرهەمی ئەمڕۆ بەس نییە و بەس نییە، و زیاتر پێویستە، بۆیە تەواوکاریی نێوان ڕۆڵی زانیاریی و ڕۆڵی پەروەردەییی گشتی و ڕۆڵی چاکسازیی گشتی لێرەوە دێت.

کاتێک کۆمەڵێک ئافرەتمان هەبن خاوەنی پسپۆڕی بن، جا پسپۆڕی پەروەردەیی، یان شەرعی، یان ڕۆشنبیریی گشتی، بە ئەندازەی بەخشین، تێربوونی زانیاری، کاتێک بۆ ئەم لایەنی پەروەردەیی گشتییە دێین، کێیە کە پێشکەشی دەکات؟! کێیە کە پەیوەندی دەکات؟! کێیە کە ...؟!

بەڕێزان ئێوە دەزانن کە زۆربەی بەرنامە زانستییەکانی ئێستا تەنانەت بەوانەشەوە کە بەشی ئافرەتەکانیان بۆ زیاد دەکرێت، بانگخوازەکان چەند کەسێک، یان چەند پیاوێکی دیاریکراون، واتە مەبەستم ئەوەیە کە زۆر نین، باشە ئەگەر پرۆگرامەکە بۆ ئافرەتان و کچان بێت، بۆچی کۆمەڵێک کەسی بەتوانامان نەبن؟! ئافرەتی وتاربێژ، کچی وتاربێژ؟!

ئەو کات ئێمە بەجێی ئەوەی یەک کەس و دوو کەسمان هەبێت کە لێهاتوو بن و توانای قسەکردنیان هەبێت، بیست و سی و چلمان دەبێت، ئەو کات لێکدان و تەواوکاریی نێوان بوارەکان دێتە ئاراوە، ئەوەش وا دەکات بوارەکان سەربەخۆ و لێکجیاواز نەبینین، ئێمە کاتێک دەڵێین بواری زانیاریی واتای ئەوە نییە کە بە تەنیا جۆرە زانیارییەکی دیاریکراو زۆر بکەین، واتای ئەوەیە من لە بوارێکی زانیاریی دیاریکراو دام، بەڵام بە یاوەریی بواری فێرکاریی و پەروەردەیی.

باشە، ئیدی ئەمە بواری پەروەردەیی گشتییە، لە باشترین شێوەیدا کە دەکرێت ببێت، شێوەی ناوەندە پەروەردەییە ئافرەتییەکانە، گوتمان بواری پێنجەم بواری چاکسازیی گشتییە، یەکێک لە شێوەکانی بواری پەروەردەیی گشتییە، زۆر بواری دیکەش هەن کە لە ناوەڕۆکیاندا دەکرێت ڕۆڵیان هەبێت لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو بەڵایانەی بەسەر ئوممەتی ئیسلامی داداوە، هەرچەندە هەندێکیان دەتوانێت تەنیا پیاوان بتوانن کار بۆ نەهێشتنیان بکەن و خوا ئەرکەکەی تەنیا بەوان سپاردبێت و پسپۆڕییەکی دیاریکراوی بووێت، کەواتە بەڵاکان زۆرن و یەک و دووان و سیان و چوار نین، ئەمانەش لقێکن لە زانست و زانیاری، بەوەی کە دەکرێت و بۆی ئاسانە.

باشە، با بڵێین ئەمە نەخشەیەکی خێرای بوارەکان بوو، بەرپرسیارییەتی ئەو ئافرەتانەی خوێنەری ئەم پەرتووکەن چییە؟ واتە ئەوانەی ڕێزیان لێنراوە بە زانست و گرنگیدان بەم بوارە و ئەزموون و شارەزایی، بەرپرسیارییەتەکەیان درێژکردنی دەستی هاوکارییە بۆ ئەوەی ئێستا پێشکەشکراوە کە بواری قسە و گفتوگۆ و پێشنیاری پڕۆژە و سوڕاندنەوەی تایەکانە بۆ پێشەوە درێژکراوەتەوە، ئەمە واتای نەخشەیە، یان بڵێین دەستپێک و لاپەڕەیەک، بەڵام چی تێدا دەنووسرێت و بە چی پڕ دەکرێتەوە؟! لە کۆتاییدا ئافرەت چاوەڕێ نەبێت کەسێک بێت و بە گشت بەرنامەکان هەستێت و گشت وردەکارییەکان دیاری بکات ... تاد. بەڵکوو دەبێت خۆیان بایەخی پێ بدەن، هەروەها ئەمە ئاگادارکردنەوەی کۆتاییە و گرنگە کە پەلەی بەرهەممان نەبێت، دڵنیابین کە بە ئەندازەی تەواوکاریی ئەم بوارانە، بە ئەندازەی چنینەوەی بەروبووم بەشێوەیەکی باشتر، بە ئەندازەی ماندووبوون لە زانست و زانیاریدا، بە ئەندازەی کاریگەرییەتی لە بواری پەروەردەیی گشتیدا، بە ئەندازەی ئەوەی ئێمە تا چەند دەبینە دەستە بۆ دابەشکردنی بوار و پسپۆڕییەکان، چەندە ئەم تەواوکارییە ڕووی لە تەواوکاری بێت، بەرەو بەروبوومی باشتر دەڕوات.

# کۆتایی

لە کۆتاییشدا کە کۆتایی ئەم کۆمەڵە نووسینە کورت و پوختەیە، پێم خۆشە پرسێ گرنگ بیر بهێنمەوە کە ئەویش بەو ئاڕاستەیەیە کە لەبارەی ئافرەتەوە قسەی تێدا دەکەین، نەک بە ئاڕاستەی دووبەرەکی و زۆران و دم بە دمە و ڕاوکردنی هزرەکان و ... تاد. بەڵکوو ئێمە دەربارەی ئاڕاستەیەکی پێویست دەدوێین، ئەم ئاڕاستە پێویستەش لقێکە لەبارەی بوونی کێشەی زۆری پەیوەست بە ڕەوشی موسڵمانان لە ڕووی ئایینداری و ڕەوشت و ئاکار و بارودۆخیانەوە، ئومێدەوارم ئەو ڕووگەیەی بڕیارە لەم پرسەدا دادوەری بکات، ڕووگەی چاکسازیکردنی واقیع و هەستانەوەی ئافرەت بێت لەو واقیعە پڕ گرفتەدا و بۆ دۆخێکی لەو باشتر و فراوانتر بڕوانێت.

هەڵبەتە ئەم پەڕتووکە لەسەر بیرۆکەی ئەرک و بەرپرسیارییەتییەکان ڕاوەستاوە نەک مافەکان، ئەم پەڕتووکە نایەت بڵێت: «ئەی ئافرەت! تۆ زۆر مافت لێ سەنراوە و زەوتکراوە و وەرە داوایان بکەرەوە.»

باشە ئەدی مافی زۆر زەوتنەکراوە؟! بەڵێ، زۆر ماف هەن کە ئیسلام بۆ ئافرەتی دەستەبەرکردوون و لە ڕاستیشدا کەمتەرخەمییان دەربارەی کراوە، بەڵام پەڕتووکەکە دەڵێت ئەو مافانە تەواوی ئەو ئامانج و ئاست و خاڵە نییە کە ئافرەت پێی بگات، باشترین ڕێگاکانی بەدەستهێنانەوەی ئەم مافانەش سەرەتا بە ئەنجامدانی ئەرک و بەرپرسیارییەتییەکانە، واتای ئەوەیە گەڕانەوە بۆ ڕێگەی ڕاست لە هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ پرسی ئافرەت و ئەو ڕێگا

ڕاستە ئەوەیە کە پرسەکانی تر ڕێک دەخات و لەنێویشیاندا پرسی مافەکان، جا بەجێی ئەوەی هەڕەمەکە هەڵگەڕاوە بێت و ڕووگەکە هەڵە پیشان بدات کە ئەویش ئەوەیە من لە چوارچێوەی مافەکاندا دەست پێ بکەم و کۆتایی پێ بهێنم، پرسەکەش هەرگیز ئەمە نییە، بەڵکوو من لە بازنەی ئەرک و بەرپرسیارییەتییەکانەوە دەست پێ دەکەم و مافەکانیش ئەو مافانەن کە لەگەڵم دان، یاخود بەدەم ڕێگاوە هەوڵی بەدەستهێنانیان دەدەم، ئەمە دەستپێک و کۆتایی نییە، بەڵکوو لە ڕیزبەندی ئەو شتانە دایە کە بۆ منە، وەکوو گوتم ئەم پەڕتووکە بۆ ئەوە نەهاتووە کە بڵێت شتێک کە ئەوپەڕی هەوڵی بۆ بدەیت، مافەکانتە، چونکە بەزۆری ئەم داواکردنە داخوازیکارەکان لەخۆبایی دەکات و دەیانخاتە ناو وەهمگەلی گەورەوە، ئەمەش (مالیکی کوڕی نەبی)م لە مەرجەکانی ڕابووندا کاتێک قسەی لەبارەی ئەزموونەکانی عەبدولحەمید بادیسەوە کرد کە چۆن یەکێک لە گرنگترین هۆکانی خنکاندنی ئەزموون گواستنەوەیە لە پرسی گرنگیدان بە ئەرکەکان بەرەو پرسی داخوازیی مافەکان و نموونەیەکی بۆ ئەمە باس کرد کە لەنێو کۆمەڵێ گەنجی زانکۆدا هەستا و گوتی: «ئێمە مافەکانمان دەوێت، ئەگەر ڕووت و قوتیش بین، ئەگەر ئاوا و ئاوا و ئاوا ...»

زۆربەی ئامادەبووانیش لەگەڵیدا هاوڕا بوون و ئەوەش سەرەنجامەکەیە و ئەو بیرۆکەیەش بیرۆکەیەکی زۆر زۆر دابڕاوە لە واقیع، لە نزمترین پلەیدا کە دەکرێت ببێت، ئەم پەڕتووکە بۆ ئەوە نەهاتووە لەسەر ئەوە ڕابێت کە دەستپێک و کۆتایی هەر مافە، بەڵکوو هاتووە بڵێت کە مافەکان یەکێکن لەو پرسانەی سەر ڕێ و ئەوەی بۆی هاتوویت و دەبێت لەسەری بیت و شکۆی ڕاستەقینە بە ئەندازەی ئەو مافانە نییە کە وەریدەگریت، بەڵکوو بە ئەندازەی ئەو ئەرک

و بەرپرسیارییەتییەیە کە لە ئەستۆی دەگریت، پێویستم بەوە نییە بڵێم کە ئەمە یەکسان نییە بەوەی بە ستەم ڕازی بیت، چونکە تەنیا کەسێک وا لەم قسەیە تێدەگات، کە ئاراستە و بەروبوومی قسە نەزانێت.

کەواتە ئەمڕۆ ئێمە دەربارەی بەرپرسیارییەتییەکی گرنگ و پێویست قسە دەکەین و بوار و کات و دەرفەتێکی زۆر نییە تا دوای بخەین و ئەمەش ئەوەندەیە کە خوای گەورە ویستوویەتی و ئاسانی کردووە لەم پەڕتووکەدا.

لە خوداش دەخوازم لێمانی قبووڵ بفەرمووێت و قسەکانمان لە دڵدا شوێنی خۆیان گرتبێت و لە واقیعدا کاریگەر بن و چاوپۆشی لە هەڵە و لادان و خلیسکانەکانمان بکات و لێمان خۆش ببێت و بە ئەندازەی چاوتروکاندنێکیش نەماندات دەست خۆمان (اللهم امین).

«وصلى الله على محمد و على آله و أصحابه أجمعين»

